# بەشكردنی میرات

ڕوونکردنەوەی

(قَطْرُ الْعَارِض فِی عِلْمِ الْفَرَائِض)

(للشيخ معروف النودەهی)

لەم هۆنراوەیەدا (فَرَائِضُ الْمَنْهَج) بە درێژی ڕوون کراوەتەوە

دانانی

عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی

چاپی یەکەم

لەسەر ئەرکی کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی لە هەولێر، چاپ کراوە

پیتچینین و کۆمپیوتەر و ڕێکخستنی: صادق وسو خۆشناو

# بەشكردنی میرات

ڕوونكردنەوەی

(قَطْرُ الْعَارِضِ فِی عِلْمِ الْفَرَائِض)

(للشیخ معروف النودەهی)

لەم هۆنراوەیەدا (فَرَائِضُ الْمَنْهَج) بە درێژی ڕوون كراوەتەوە

دانانی

**عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی**

**چاپی یەكەم**

ڕەمەزان - ١٤٢٢ی كۆچی

سەرماوەز - ٢٧٠١ی كوردی

كانوونی یەكەم - ٢٠٠١ی زایینی

بسم الله الرحمن الرحيم

هــذه ميــامنُ مــنْ مــنّ مــنّ مِــنْ عنْــده عَلــى عبْــــده الرَّقيـــق
نعمْ نعْـــم نعـــم مــنْ نعــم مَــنْ لا نعــم إلاّ نعمُـــهُ مِــنَ الْجَليـــل والدَّقِيـــق

**پێشکەش:** بـه ئـەو مامۆسـتا بەڕێزانـەی مـیراتگری پێغەمبـەرنو ﷺ بـەو فـەقێ ڕێزدارانـەی مەلائیکـەی خـوا باڵی خۆیانیـان بـۆ دادەنێـنو، ماڵو خـزمو کەسـی خۆیان بەجێ هێشتووەو، شار بە شارو دۆڵاو دۆڵ دەگەڕێنو لـه کـاروانی (جـهاد) بەردەوامن تا لە سەنگەری زانستی ئایینیدا دژ بە نەزانیو نەخوێندەواریو ستەم دەوەستنو، بە ڕووناکی شەریعەتی خواو پێغەمبەر ﷺ تاریکیی ستەمی یاسـای دەستکرد دەڕەوێننـەوەو، خـەڵکی لـه بەندایـەتی بـەندە ڕزگـار دەکـەنو بـۆ بەندایەتی خوای گەورە ڕێنموونیمان دەکەن...

## دانراوەکانی تری دانەر:

١- هۆنراوەی ئیمانو ئیسلام
٢- عەقیدەی ئیسلامی
٣- ڕوونکردنەوەی (العقیدة الطحاویة)
٤- ڕوونکردنەوەی (الأربعین النواویة)
٥- ڕۆژی پڕشنگدار: ڕوونکردنەوەی (متن فتح القریب)
٦- چەند گوڵێك لە گوڵزاری ئیسلام
٧- ڕووناکی (ربّ العالَمین) ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین)


ناوی کتاب: بەشکردنی میرات ڕوونکردنەوەی (قطْرُ الْعارض فی علْم الفرائض)
ناوی دانەر: عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی
چاپ: یەکەم ٢٠٠١
پیتچینین: کۆمپیوتەر بڵند/ هەولێر بەرامبەر پەروەردەی گشتی. ☎:٢٢٢١٤٢٩. صادق وسو خۆشناو
چاپخانە: وەزارەتی ڕۆشنبیری هەولێر
ژمارەی چاپکراو: ٤٠٠٠ دانە

بسم الله الرحمن الرحيم

الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِين وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين.

ئەی موسوڵمانی ڕێزدار -هەروەك ئاشكرایە- زانستی بەشكردنی میرات یەكێكە لەو زانستە گرنگانەی لە قورئانی پیرۆزو حەدیسو (إجماع)ی زانایانی ئیسلام وەرگیراون، بە تایبەتیش پێغەمبەر ﷺ زۆر بایەخی بە زانستی میرات بەشكردن داوەو، (صحابة)كانیشی هان داون بۆ فێربوونی ئەو زانستەو بە زانستێكی زۆر گرنگی داناوەو، دەفەرموێ: ﴿اَلْعِلْمُ ثَلاَثَةٌ وَمَا سِوَى ذَالِكَ فَهُوَ فَضْلٌ: آيَةٌ مُحْكَمَةٌ أَوْ سُنَّةٌ قَائِمَةٌ أَوْ فَرِيضَةٌ عَادِلَةٌ﴾ صححه الحاكم، زانستی زۆر پێویست سێ زانستن ئەوەی تر زێدە زانستێكە: ڕوونكردنەوەی قورئانی پیرۆز، ڕوونكردنەوەی حەدیسی پێغەمبەر ﷺ، فێربوونی میرات بەشكردنێكی دادپەروەرانە.

ئینجا لەلای مامۆستاو فەقێ ڕێزدارەكانی كوردستان (فَرَائِضُ شَرْحِ الْمَنْهَجِ) لە گشت كتێبەكانی تر زیاتر پەسند كرابوو، بۆیێ زانای بە ناوبانگ (الشیخ معروف النودەهی) ئەو بەشەی (فَرَائِضُ الْمَنْهَجِ)ی كردۆتە هۆنراوەیەكی زۆر خۆشو ئاسانو، ناوی ناوە: (قَطْرُ الْعَارِضِ فِي عِلْمِ الْفَرَائِضِ)، ئینجا هەر بە خۆیشی (شَرْحِ)ی ئەو هۆنراوەی كردوەو، ناوی ناوە: (كَشْفُ الْغَامِضِ شَرْحُ قَطْرِ الْعَارِضِ). خوای گەورە پاداشتی چاكەی بداتەوە، آمین.

جا لەبەر ئەوەی ئەم هۆنراوەیە زۆر بە سوودەو لەبەر كردنیشی زۆر ئاسانەو، زۆریشم پێ خۆش بوو: فەقێیەكانی كورد -وەكو من- سوود لەو هۆنراوەیە وەربگرن، ناوی خوام لێ هێناو، هۆنراوەكەم بە زمانی شیرینی كوردی ڕوون كردەوەو، ناوم نا ﴿ڕوونكردنەوەی (قَطْرُ الْعَارِضِ فِي عِلْمِ الْفَرَائِضِ)﴾، جا بۆ ئەو ڕوونكردنەوەیە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە.

**یەكەم:** (كَشْفُ الغامِضِ) كە (شَرْح)ی هۆنراوەیەكەو دانراوی دانەرە. **دووەم:** (شَرْحِ الْمَنْهَجِ مع حاشِيَةِ الْبُجَيْرِمِي). **سێیەم:** (تُحْفَةُ الْمُحْتَاجِ شَرْحِ الْمِنْهَاجِ مَعَ حَاشِيَةِ الشرواني). **چوارەم:** (نِهَايَةُ الْمُحْتَاجِ شَرْحِ الْمِنْهَاجِ). **پێنجەم:** (مُغْنِى الْمُحْتَاجِ). **شەشەم:** (شَرْحِ الرَّحَبِيَّةِ مَعَ حَاشِيَةِ البَقَرِي)و، چەند سەرچاوەیەكی تریش كە لە شوێنی خۆیاندا ناویان گوتراوە.

جا ئەی ماموستای ڕێزدارو ئەی فەقێی گرانقەدر ئەگەر لە شوێنێکی ئەو ڕوونکردنەوەیە گومانت هەبوو، یان ڕەخنەت هەبوو، بگەڕێوە سەر ئەو سەرچاوانەی ناوم هێناون، جا ئەگەر بینیت هەڵەم کردوە، تکات لێ دەکەم: هەڵەکەم ڕاست بکەوەو تکای لێبوردن بۆ منو بۆ خۆت لە خوای گەورە بکە، چونکە من دان بەوە دائەهێنم کە من سواری ئەم مەیدانە نیم، بەلام چونکە تا ئێستا نەمزانیوە بەو شێوەیە بە زمانی کوردی ئەم هۆنراوەیە ڕوون کرابێتەوە، بۆیێ بە پێویستم زانی بە خۆم ئەم کارە ئەنجام بدەم، بەلام لەوە ڕەخنەم لێ مەگرە کە دەبینی: زۆر جار واتەی ووشەکانم نەگوتووە، بەڵکو مەبەستەکەم بە کورتی ڕوون کردۆتەوە؟ چونکە بۆ کورتیو ئاسانی وام کردوە.

ئینجا لە دروستکردنو ساغکردنەوەی مەسەلەکاندا: ئەم نیشانەم (×) بۆ لێدانی ژمارەکان داناوەو، ئەمەشم (+) بۆ کۆکردنەوەی ژمارەکان داناوەو، ئەمەشم (÷) بۆ بەشکردنی ژمارەکان داناوە. ئیتر لە خوای گەورە دەپارێمەوە ئەم کارەم لێ قبوڵ بکاو بیکاتە ڕوونکردنەوەیەکی سوود بەخش بۆ گشت خوێندەوارێك، بە تایبەتیش بۆ ماموستاو فەقێیەکانی کورد، آمین، وصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين وَالْحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين.

**عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی**

**هەولێر/ کوردستان**

## ﴿پێناسەیەکی کورتی (الشیخ معروف النودەهی)﴾

ئەم بەرێزە ناوی (محمد)ە، بەلام ناسراوە: بە (شێخ معروف) کوڕی (سید مصطفی) کوڕی (سید أحمد) لە سەیدەکانی (الحسینی) بەرزنجەیەو، لە گوندی (نۆدە)ی سەر بە (چوارتا)ی ناوچەی (سلێمانی) لە باشوری کوردستان، لە ساڵی (١١٦٦) هەزارو سەدو شەستو شەشی کۆچی لە دایك بووەو، لە ساڵی (١٢٥٤) هەزارو دووسەدو پەنجاو چواری کۆچی لە شاری (سلێمانی) وەفاتی کردوە، ئەم بەرێزە باوکی (کاك أحمدی شێخ)ەو، چەند دانراوێکی تری بە نرخی هەیە لە چەند زانستێکی جۆراو جۆردا، یەکێك لە دانراوەکانی:هۆنراوەی (ئەحمەدی)یە: کە فەقێیەکان لە دوای (ختم) کردنی قورئانی پیرۆز دەیخوێنن، ئیتر ئەم بەرێزە زۆر لەوە بەناوبانگترە: کە من بە تەواوی ژیاننامەی بنووسم، بۆیێ دەست بە ڕوونکردنەوەکەم دەکەمو دەڵێم: ئەم بەرێزە دەفەرموێ:

بسم الله الرحمن الرحيم

| | | |
|---|---|---|
| قَالَ فَقِيرُ رَبِّهِ الرَّؤُف | ١ | مُحَمَّدُ الشَّهِيرُ بِالْمَعْرُوف |
| أَحْمَدُكَ اللَّهُمَّ مُؤْتِي الْحِكَم | ٢ | وَوَارِثَ الْخَلْقِ وَبَاعِثَ الرِّمَم |
| وَقَاسِمَ الثُّرَاثِ بَيْنَ أَهْلِهِ | ٣ | بِمُقْتَضَى حِكْمَتِهِ وَعَدْلِهِ |
| مُصَلِّيًا عَلَى نَبِيِّكَ الَّذِي | ٤ | هَدَى إِلَى مَنْهَجِ دِينِكَ الشَّذِي |
| مَنْ حُسْنُهُ مُبَايِنُ الْخَلاَئِقِ | ٥ | بِلاَ مُمَاثِلٍ وَلاَ مُوَافِقِ |
| بَلْ كُلُّ مَنْ شَاهَدَهُ بِعَيْنِهِ | ٦ | حُجِبَ عَنْ إِبْصَارِ كُلِّ حُسْنِهِ |
| مَنْ جَاءَ بِالْقُرْآنِ خَيْرِ مَا نَزَلْ | ٧ | وَمِلَّةٍ نَاسِخَةٍ كُلَّ الْمِلَلْ |

---

(بسم الله الرحمن الرحيم) بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ئەم هۆنراوەیە دادەنێم (قَالَ فَقِيرُ رَبِّهِ الرَّؤُف) بەندەی پێویست بە پەروەردگارە زۆر بە رەحمەکەی خۆی: کە ناوی (مُحَمَّد)ی کوڕی (مصطفی)یەو (الشَّهِيرُ بِالْمَعْرُوف) ناسراوە بە (شێخ مەعروف نۆدەهی) دەفەرموێ: (أَحْمَدُكَ اللَّهُمَّ مُؤْتِي الْحِكَم) حەمدو شوکرت دەکەم ئەی ئەو خودایەی کار لەجێیی دەدەیە بەندەکانی خۆت (وَوَارِثَ الْخَلْقِ) ئەی ئەو خودایەی لە دوای نەمانی دروستکراوی خۆت هەر دەمێنیو (وَبَاعِثَ الرِّمَم) ئێسقانە ڕزیوەکانیش زیندوو دەکەیتەوە (وَقَاسِمَ الثُّرَاثِ بَيْنَ أَهْلِهِ) ئەی دابەشکەری میرات لە نێوان میراتگرەکاندا (بِمُقْتَضَى حِكْمَتِهِ وَعَدْلِهِ) بە گوێرەی خواستراوی کار لە جێیی و دادپەروەری خۆی.

(مُصَلِّيًا عَلَى نَبِيِّكَ الَّذِي) ئینجا لە دوای حەمدو شوکر، سەلاوات و سەلام لێ دەدەم لەسەر ئەو پێغەمبەرەی تۆ: کە (هَدَى إِلَى مَنْهَجِ دِينِكَ الشَّذِي) خەڵکی شارەزا کردوە بۆ ڕێگەی ئاینە بۆنخۆشەکەت (مَنْ حُسْنُهُ مُبَايِنُ الْخَلاَئِقِ) ئەو پێغەمبەرەی جوانیەکەی جیایە لە خەڵك؟ چونکە گەیوەتە پلەی هەرە بەرزی جوانیو (بِلاَ مُمَاثِلٍ وَلاَ مُوَافِقِ) لەو جوانیەشدا هیچ ئادەمیزادێك هاوێنەی پێغەمبەر ﷺ نیە (بَلْ كُلُّ مَنْ شَاهَدَهُ بِعَيْنِهِ) بەڵکو پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە جوانە: هەر کەسێك بە چاوی خۆی دیتبای (حُجِبَ عَنْ إِبْصَارِ كُلِّ حُسْنِهِ) بەهۆی پەردەیەکی خوایی نەیدەتوانی هەموو جوانیەکەی ببینێ، واتە: هیچ کەسێك لە دونیادا نەیتوانیوە جوانیی پێغەمبەر ﷺ بە تەواوی ببینێ (مَنْ جَاءَ بِالْقُرْآنِ خَيْرِ مَا نَزَلْ) ئەو پێغەمبەرەی کە قورئانی بۆ ئوممەتەکەی هێناوەو (وَمِلَّةٍ نَاسِخَةٍ كُلَّ الْمِلَلْ) شەریعەتێکی وەهایشی هێناوە: کە گشت شەریعەتەکانی ڕابردووی ڕەش کردوونەتەوەو لایبردوون.

وَآلِـــهِ وَصَحْبِـــــهِ الْكِــــرامِ ٨ وَالعَصَبـــاتِ وَذَوِي الأَرْحَـــــامِ

مَـــاوُورِي الأَمْـــواتُ بِــــالأَجْداث ٩ وَصُحِّحَـــتْ مَســـــائِلُ الْمِـــيراث

فَـــهَذه أُرْجُــــوزَةٌ مُحَـــــرَّرَةْ ١٠ جَوْهَــرَةٌ تَفُوقُ كُــــلَّ جَوْهَــرَةْ

خلتْ عَـــنِ الْحَشْـــوِ وعَــنْ تعْقِيــدِ ١١ هَيِّنَـــةٌ حَتَّـــى عَلَـــى البَلِيـــدِ

ضَمَّنْتُـــهَا مَســـائِلَ الفَرائِـــضِ ١٢ مُسَـمِّيًا لَــها بِقَطْــرِ الْعَــارِضِ

وَأَصْلُـــها الَّــذِي نَظَمْـــتُ نَـــثْرَهُ ١٣ وَفِـــي قَوافِيـــها قَفَـــوْتُ إِثْـــرَهُ

فَرائِـــضُ الْمَنْـــهَجِ فَـــهُوَ أَجْمَـــعُ ١٤ مُخْتَصَـــرٍ رَأَيْتُـــــهُ وَأَبْـــدَعُ

---

(وَآلِه وَصَحْبِه الْكِرامِ) سەلاوات‌و سەلام لەسەر خزمە ئیماندارەکانی پێغەمبەریش بن ﷺ کە ڕێزدارو سەخینە (وَالعَصباتِ وَذَوِي الأَرْحَامِ) هەم سەلاوات‌و سەلام لەسەر خزمەکانی پشتێی‌و خزمە خاوەن ڕەحمەکانی بێ (مَاوُورِيَ الأَمْواتُ بِـالأَجْداث) سەلاوات‌و سەلام هەر بەردەوام بن تا بەردەوام مردووەکان لە گۆڕدا دەشـاردرێنەوەو (وَصُحِّحَتْ مَسائِلُ الْمِيراث) تا بەردەوام مەسەلەکانی میرات ساغ دەکرێنەوە.

(فَهَذه أُرْجُوزَةٌ مُحرَّرَةْ) ئەمە هۆنراوەیەکی پوختە کراوە (جَوْهَرَةٌ تَفُوقُ كُلَّ جَوْهَـرَةْ) وەك گەوهەرێکە: کە لە بە نرخی‌و بێگەردی دا دەکەوێتە سەرەوەی گشت گەوهەرێك (خَلَتْ عَنِ الْحَشْوِ وعَنْ تَعْقِيد) زێدەیی بێ سوودی تێدا نیەو، ووشەی نـا ئاشکراشی تێدا نیە (هَيِّنَـةٌ حَتَّـى عَلَـى البَلِيـد) خوێندنـی لەسـەر خوێنـەرەکان ئاسانە، تـا لەسـەر مرۆڤـی نازیرەکیش هەر ئاسانە (ضَمَّنْتُها مَسائِلَ الفَرائِض) مەسەلەکانی میراتم خستۆتە ناو ئەو هۆنراوەیە (مُسَمِّياً لَها) لە حاڵەتێکدا ناوم ناوە (بـ) بـە (**قَطْرِ الْعَارِض**)، واتـە: بارانی هەور، چونکە وەك باران سوودی هەیە، الْحَمْـــدُ لله منیش -کە ڕوونکـەرەوەی ئـەم هۆنراوەیەم- زۆر سوودم لێ وەرگرتوە، خوای گەورە پاداشتی دانەرەکەی بداتەوە.

(وَأَصْلُها الَّذِي نَظَمْتُ نَثْرَهُ) بنچینەی ئەو هۆنراوەیە: کە ووشەکانیم هۆندۆتـەوەو (وَفِـي قَوافيها قَفَوْتُ إِثْرَهُ) لە شیعرەکانیدا -بە دوایدا- شوێنی کەوتووم (فَرائِضُ الْمَنْـــهَجِ) باسی میراتە لە کتێبی (الْمَنْهَج)ی دانراوی ئیمام (زکریا الأنصـــاری)، کـە ئـەویش لـە (مِنْهاج)ی ئیمامی (النَّـــواوی) کورتـی کردۆتـەوە، واتـە: ئـەم هۆنراوەیـەم لـە (کتاب الفَرائِض)ی (الْمَنْهَج) پێك هێنـاوە، چونکـە (فَـهُوَ أَجْمَـعُ مُخْتَصَرٍ رَأَيْتُـهُ وَأَبْدَعُ) کتێبی (الْمَنْهَج) لە گشت کتێبێکی کورتکراوە -کە مـن دیتبێتـم- زیاترو جوانـتر ئـەو باسـەی

وَلِـي زِيـادَاتٌ عَلَيْـهَا جُمَّـةٌ ١٥ مَسَـائِلٌ وَمُثُـلٌ مُهِمَّـةٌ

نَقَلْتُـهَا إِذْ هِـيَ لاَ يَسْـتَغْنِي ١٦ عَـنْ فَهْمِـهَا طَـالِبُ هَـذَا الفَـنِّ

عَـنْ كُتُـبٍ مُعَـوَّلٍ عَلَيْـهَا ١٧ مِـنْ غَـيْرِ أَنْ أَعْزُوَهَـا إِلَيْـهَا

وَكَـانَ حَـامِلِي عَلَيْـهَا عُصْبَـةٌ ١٨ مِـنْ سَـادَةٍ وَغَـيْرِهِمْ أَحِبَّـةٌ

وَإِنَّ هَذَا العِلْـمَ خَـيْرُ الْخَلْـقِ قَـدْ ١٩ حَـثَّ عَلَيْـهِ صَحْبَـهُ كَمَـا وَرَدْ

يَـارَبِّ انْفَعْنِـي بِـهَا وَانْفَـعْ بِـهَا ٢٠ مَـنْ أَخْلَـصَ النِّيَّـةَ فِـي مَطْلَبِـهَا

---

میراتی کۆکردۆتەوە (وَلِـي زِيـادَاتٌ عَلَيْـهَا جُمَّـةٌ) منیش چەند زێدەییەکی زۆرم لەسەر میراتی (الْمَنْهَج) هەیە: کە (مَسائِلٌ وَمُثُلٌ مُهِمَّـةٌ) چەند مەسەلەو وێنەیەکی گرنگن بۆ خوێنەران (نَقَلْتُهَا) هێناومنە ناو ئەو هۆنراوەیە (إِذْ هِيَ لاَ يَسْتَغْنِي عَنْ فَهْمِـهَا طَـالِبُ هَذَا الفَنِّ) چونکە خوێنەری میرات پێویستی بە تێگەیشتنیان هەیە، جا ئەو مەسەلەو، وێنانەم هێناون (عَنْ كُتُبٍ مُعَوَّلٍ عَلَيْها) لە چەند کتێبێکی پشت پێبەستراو (مِنْ غَـيْرِ أَنْ أَعْزُوَهَا إِلَيْهَا) بێ ئەوەی نیسبەتیان بدەمە لای کتێبەکان، واتە: ناوی کتێبەکان نالێم نەوەك هۆنراوەکە درێژ ببێ.

(وَكَانَ حَامِلِي عَلَيْهَا عُصْبَةٌ) ئەوەی هانی دام بۆ دانانی ئەم هۆنراوەیە، کۆمەڵێك بوون (مِنْ سَادَةٍ) لە پیاو ماقوڵانی ئایینیو (وَغَيْرِهِمْ أَحِبَّةٌ) جگە لەوانیش لە فەقێ بەڕێزەکان کە زۆر خۆشەویست بوونو، منیان خۆش دەویا (وَ) هەروەها ئەوەی هانی دام ئەوە بوو: (أَنَّ هَذَا العِلْمَ) ئەو زانستەی میرات (خَيْرُ الْخَلْقِ قَدْ حَثَّ عَلَيْـهِ صَحْبَـهُ) چاکترینی خەڵك کە پێغەمبەرمانە ﷺ هانی (صَحابَة)کانی داوە بۆ فێربوونیی (كَمَا وَرَدْ) هەروەك لە حەدیسێکدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿تَعَلَّمُوا الفَرَائِضَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ فَإِنِّي امْـرُؤٌ مَقْبُوضٌ﴾ صَححه الحاكم وغيره، فێری زانستی میرات بن‌و، خەڵکیش فێرە زانستی میرات بکەن، چونکە من مرۆڤێکم دەمرمو لەناوتاندا نامێنم میراتتان بۆ بەش بکەم.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ مەدحی (زيد) دەکا —کە (صَحابَة)یەکی خۆیەتی— و دەفەرموێ: ﴿أَفْرَضُكُمْ زَيْدُ بنُ ثابتٍ﴾ صححه الترمذي وغيره، زاناترتان لە میراتدا (زيد)ی کوڕی (ثابت)ە ؓ (يَارَبِّ انْفَعْنِي بِها) خوایە سوودم پێ بگەیەنە بە دانانی ئەم هۆنراوەیە (وَانْفَعْ بِها مَنْ أَخْلَصَ النِّيَّةَ في مَطْلَبِهَا) هەروەها سوود بەو کەسەش بگەیەنە: کە بە نیەتێکی بێگەرد ئەم هۆنراوەیە دەخوێنێ.

هَذا مَبْحَثُ مَا يُفْعَلُ بالتَّركَةِ وَما يَتعَلّقُ بها مِنَ الْحُقُوق

يُبْدَأُ مِنْ تَركَةٍ بأَمْرِ ٢١ عَلَّقَ بالْعَيْنِ بغَيْرِ حِجْرِ
كَكَسْبِ عَبْدٍ وَمَبِيعٍ يَفْنَى ٢٢ مَنِ اشْتَرَاهُ مُفْلِساً وَالسُّكْنَى
لإِمْرَأَةٍ تَعْتَدُّ عَنْ وَفَاةِ ٢٣ وَالقَرْضِ وَالقِرَاضِ وَالزَّكَاةِ

---

## ﴿هَذا مَبْحَثُ مَا يُفْعَلُ بالتَّركَةِ وما يَتعَلَقُ بها منَ الْحُقُوقِ: ئەمە باسی ئەو پێنج مافانەیە: کە پەیوەندییان بە میراتەوە هەیە﴾

**مافی یەکەم:** (يُبْدَأُ منْ تَركَةٍ بأَمْرٍ) پێش ئەرکی وەڕێکردنی مردووەکە بۆ گۆڕەکەی، واجبە: لە میراتەکەی دەست بەو مافە بکرێ: کە (عَلَّقَ بالْعَيْنِ) بە خودی میراتەکەوە بەستراوە (بغَيْرِ حِجْرِ) بێ ئەوەی مردووەکە لە ژیانیدا قەدەغەی لەسەر داندرابێ، جا ئەو مافە: (كَكَسْبِ عَبْدٍ) وەك بەرهەمی ئەو کارەی کۆیلەی مردووەکە کردوویەتی، پێش وەڕێکردنی مردووەکە، لەو بەرهەمە ئەرکی بەخێو کردنی کۆیلەکەو ژنەکەی دادەندرێ (وَ) هەم وەکو (مَبِيعٍ) فرۆشراوێکی بە قەرز، کە (يَفْنَى مَن اشْتَرَاهُ مُفْلساً) ئەو کەسەی بە قەرز کڕیویەتی بە نەبوویی بمرێو، بە هۆی نەبوونی پارەکەی نەدابێ، ئەوەش ڕێگە دەدرێتە فرۆشیارەکە پێش وەڕێکردنی مردووەکە مامڵەتەکە هەڵبوەشێنێتەوەو، خودی فرۆشراوەکەی خۆی بباتەوە، بەڵام ئەگەر مردووەکە هەبوویی بێو پارەکەی نەدابێ، ئەو کاتە مامڵەتەکە هەڵناوەشێتەوە، بەڵکو لە میراتەکەی پارەکەی دەدرێ.

(وَ) هەروەها وەکو (السُّكْنَى) مافی نیشتەجێ کردن (لإمْرَأةٍ تَعْتَدُّ عَنْ وَفَاةٍ) بۆ ژنی مردووەکە، کە لە (عدة)ی مردن دایە، واتە: پێش وەڕێکردنی مردووەکە کرێی نیشتەجێ کردنی بۆ دادەندرێ تا (عدة)ی مێرد مردنی تەواو دەبێ (وَ) هەم وەکو (القَرْضِ) شتی بە قەرز دراو، کە قەرزدارەکە بمرێو، خودی قەرز کراوەکەش مابێو، هیچی تریشی نەبێ، ئەوە پێش وەڕێکردنی مردووەکە، بۆ قەرزدەرەکە دروستە: خودی شتەکەی خۆی بباتەوە (وَ) هەم وەکو (القراض) مامڵەتی قازانج بە هاوبەشی، کە لە دوای قازانج کردنو پێش بەشکردنی قازانج خاوەنەکە بمرێ، ئەوەش پێش وەڕێکردنی مردووەکە بەشە قازانجی کرێکارەکە دەدرێ (وَ) هەم وەکو (الزَّكَاة) ئەو زەکاتەی پێش مردنی خاوەنەکە لە خودی ماڵێکیدا واجب بوویێو زکاتەکەیشی نەدابێ: وەك زەکاتی ئاژەڵەکانی نەدابێ، یان زەکاتی دانەوێڵەی نەدابێ، ئەوەش واجبە: پێش وەڕێکردنی مردووەکە زەکاتەکە بدرێ.

وَالْجَـان وَالنُّجُـوم وَالْمَرْهُـون ٢٤ فَمُـؤَن التَّجْـهِيز لِلْمَمُـون
بِمَـا يَلِيـقُ حَالَـةَ الْمَنِيَّـةْ ٢٥ عُرْفـاً بِـهِ، فَـالدَّيْن، فَالوَصِيَّـة

---

(وَ) هەروەها وەكو (الْجَان)ی كۆیلەی تاوانكار: كـە پێش مردنـی گەورەكـەی تـاوانێكی كردبێ‌و تۆڵەی تاوانەكەش بە گەردەنیەوە بەسترابێ، ئەوەش واجبە: پێش وەڕێكردنی مردووەكـە، تۆڵـەی تاوانەكـە لـە خـودی كۆیلەكـە بـدرێ (وَ) هـەم وەكـو (النُّجُـومِ) داشكاندنی بەشێك لە بەشەكانی نووسراو پێدان، كـە گەورەكـە ماڵەكـەی وەرگرتبـێ‌و، هیچیشـی نەدابێتـە كۆیلەكـەو هیچیشـی بـۆ دانەشـكاندبێ، ئـەوەش واجبـە: پێـش وەڕێكردنی مردووەكە بەشێكی ماڵەكـە بدرێتـەوە نووسـراو پێدراوەكـە (وَ) هـەم وەكـو (الْمَرْهُون) ماڵی بە بارمتە داندراو بۆ قەرزێك، ئەوەش واجبە: مافی ڕەهنوەرگرەكە پێش وەڕێكردنی مردووەكە بدرێتەوە. **هەروەها** وەكو نەزر، واتە: ئەگەر پێش مردنی خـودی ماڵێكی نەزر كردبێتە كەسێكی تر، ئـەوەش واجبـە: خـودی شـتەكە پێش وەڕێكردنـی مردووەكە بدرێتە نەزر بۆ كراوەكە، **هەروەك** لە (بجيرمي)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

**مافی دووەم:** (فَـ) لە دوای جێبەجێ كردنـی ئـەو مافانـەی ڕابـردوو، دەست دەكرێ بـە (مُؤَن التَّجْهِيز لِلْمَمُون) ئەركی وەڕێكردنی مردووەكە بۆ ناو گۆڕەكەی: وەك شـۆردنیو، كفـن كردنـی‌و، نوێژ لەسـەر كردنـی‌و، ناشـتنی (بِمَا يَلِيـقُ حَالَـةَ الْمَنِيَّـةْ) بـە گوێـرەی لێوەشانەوە لەو مردووە لە حاڵەتی مردنیدا (عُرْفاً بِهِ) بە گوێـرەی هـەبوونی‌و نـەبوویی مردووەكە، **ئینجا بزانە:** ئەركی وەڕێكردنی ژنە مردووەكە –بە فـەرموودەی ڕاسـتتر– لەسەر مێردەكەیەتی، واتە: لە میراتی ژنەكە نادرێ بەو مەرجـەی لـە حاڵـەتی مردنیـدا مێردەكەی هـەبوویی بـێ‌و، ژنەكـەش تەسلیمی مێردەكـەی كرابـێ‌و، (نَاشِزَة) نـەبێ‌و، تـەلاقدراوی (بـائِن)ش نـەبێ، ئـەگینا: ئەركەكـە لـە میراتەكـەی دەدرێ، هـەروەك لـە (تحفة)و (مغنى) لە باسی كفن كردنی مردوودا ڕوونكراوەتەوە.

**مافی سێیەم:** (فَـ) لە دوای تەواو بوونی وەڕێكردنی مردووەكە بۆ ناو گۆڕەكەی، دەست دەكرێ بە (الدَّيْن) دانـەوەی ئـەو قەرزانـەی لـە ئەسـتۆی مردووەكەدانـە، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّـى يُقْضَـى عَـنْهُ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي، گیانی مرۆڤی ئیمـاندار –بـە هـۆی قەرزەكـەی– قەدەغـە دەكـرێ لـە چوونـە بەهەشت تا قەرزەكەی دەدرێتەوە. ئینجا لە دانەوەی قـەرزەكانیش قـەرزەكانی خـوای گەورە: وەكو زەكات‌و حەجی واجبو كـەففارەت‌و نـەزر، وەپێش قـەرزی ئـادەمیزادان

دێخرێن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَدَيْـنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى﴾ رواه الشيخان، قەرزی خوای گەورە لە پێشترە بدرێتەوە.

**مافی چوارەم:** (فَـ) لە دوای دانەوەی هەموو قەرزەكان (الوَصِيَّةُ) وەسێتی مردووەكە جێبەجێ دەكرێ (مِنْ ثُلْثِ بَاقٍ بَعْدَهُ) لە سێیەكی ئەو میراتەی لە دوای قەرز دانەوەكە ماوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْـنٍ﴾ میراتەكە دەدرێتە میراتگرەكان لە دوای جێبەجێ كردنی وەسێتو قەرز دانەوە، **ئینجا بزانە:** مەبەست لە میرات: گشت مافێكو گشت پارەو زێرو ملكوماڵو زەویو خانووە: كە لە پاش مردووەكە بەجێ دەمێنێو، هەم خوێنی كوژراوەكەش كە لە مرۆڤكوژەكە وەردەگیرێ ئەویش بە میرات دادەندرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە، كەواتە: ئەو خوێنەش لە دوای جێبەجێ كردنی ئەو چوار مافانەی ڕابردوو دەدرێتە میراتگرەكان بە گوێرەی بەشە میراتی خۆیان.

**مافی پێنجەم:** (فَالبَاقِي) ئەو میراتەی كە لە دوای جێبەجێ كردنی وەسێت دەمێنێتەوە (لأَهْلِ إِرْثٍ) بۆ میراتگرەكانی مردووەكەیەو لە نێوانیاندا بەش دەكرێ (حَسَبَ اسْتِحْقَاق) هەر یەكەیان بە گوێرەی مافی خۆی لەو میراتەدا، كە شەریعەتی ئیسلام بۆی داناوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِقْسِمُوا الْمَالَ بَيْنَ أَهْلِ الفَرَائِضِ عَلَى كِتَابِ اللهِ تَعَـالَى﴾ رواه مسلم وأبو داود، میراتی مردووەكە لە نێوان میراتگرەكانیدا بەش بكەن بە گوێرەی قورئانی پیرۆز، واتە: كە لە سورەتی (النّساء)دا خوای گەورە دایناوە. كەوابوو: هەر كەسێك بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام –بە یاسای دەستكرد– میرات بەش بكا، یان وەری بگرێ: ئەوە ئەگەر باوەڕی بە شەریعەتی ئیسلام نەبێ: كافرە، ئەگەر نا: (ظالم)و (فاسق)ەو، ئەو میراتەی بە ناشەرعی وەری گرتووە، نابێتە ملكی خۆیو لێی حەرامە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَـأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قال ابن عبّاس ﷺ في تفسيرها: ﴿مَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ جَاحِدًا بِهِ فَقَدْ كَفَرَ، وَمَنْ أَقَرَّ بِهِ وَلَمْ يَحْكُمْ فَهُوَ ظَالِمٌ فَاسِـقٌ﴾ رواه ابن جرير، هەر كەسێك ڕەفتار بە قورئانی پیرۆز نەكاو باوەڕیشی پێی نەبێ: ئەوە كافر دەبێ، وە هەر كەسێك باوەڕی پێی هەبێ بەڵام ڕەفتاری پێ نەكا: ئەوە (ظالم)و (فاسق)ە. واتە: هەروەك لە دوو ئایەتەكەی تردا فەرموویەتیو، لە (تفسير ابن كثير)دا ڕوون كراوەتەوە.

وَالدَّيْــنُ لاَ يَمْنَــعُ مِــنْ أَنْ يَمْلِكَــــا ٢٧ وَرَثَــةُ الْمَيِّــتِ مَــا قَـــدْ تَرَكَـــا
لَكِــنْ بِــــهِ عَلَّــــقَ كَــــالْمَرْهُون ٢٨ لأَنَّـــهُ أَحْــــوَطُ لِلْمَدْفُـــــون
فَلَــمْ يَكُــنْ تَصَــرُّفٌ فِيـهِ نَفَــــذْ ٢٩ مِــنْ وارِثٍ إِذْنَ الغَــرِيمِ مَــا أَخَــــذْ

---

(وَالدَّيْنُ لاَ يَمْنَعُ مِنْ) ئەو قەرزەی لەسەر مردووەکەیە ڕێگەی ئەوە ناگرێ: کە (أَنْ يَمْلِكَا وَرَثَــةُ الْمَيِّتِ مَا قَدْ تَرَكَا) میراتگرەکانی مردووەکە ببنە خاوەنی میراتەکە، بەڵکو میراتەکە دەبێتە ملکی میراتگرەکانو، گشت سوودو بەرهەمێکی میراتەکەش هەر بۆ ئەوانە (لَكِنْ بِهِ عَلَّقَ) بەڵام قەرزەکە بە میراتەکەیەوە دەبەسترێو، میراتەکەش دەبێتە ڕەهنکراوێکی شەرعی (كَالْمَرْهُونِ) وەك بەسترانی قەرز بە ڕەهنکراوێکی دەستکرد (لأَنَّهُ أَحْوَطُ لِلْمَدْفُونِ) چونکە ئەو بەسترانە پارێزکاری زیاترە بۆ مردووەکەو زووتر قەرزەکەی لە ئەستۆ لادەچێ، (فَـ) کەوابوو: تا بەشێکی قەرزەکە لەسەر مردووەکە مابێ (لَمْ يَكُنْ تَصَرُّفٌ فِيهِ نَفَذْ) هیچ دەستکاریيەك: وەك فرۆشتنو، بەخشینو، نەزر کردنو، بەکرێدان... لەو میراتەدا جێبەجێ ناکرێ: کە دەستکاریيەکە (مِنْ وارِثٍ) لە میراتگرێکەوە ڕوویدا: کە (إِذْنَ الغَرِيمِ مَا أَخَذْ) ئیزنی خاوەن قەرزەکەی وەرنەگرتبێ، واتە: بەڵام ئەگەر میراتگرەکە بە ئیزنی خاوەن قەرزەکان –بۆ قەرز دانەوە– میراتەکە بفرۆشێ، ئەو کاتە فرۆشتنەکەی دروست دەبێ، بەو مەرجەی فرۆشتنەکە بە نرخی هاووێنە بێو بە ئیزنی گشت خاوەن قەرزەکان بێ، جا ئەگەر یەکێکیان ئامادە نەبوو، ئەو کاتە بە ئیزنی قازی دەیفرۆشێ، هەروەك لە (تحفة) لە کۆتایی (رهن)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾ **یەکەم:** هەر کاتێك شتێکی دۆزیەوەو کردیە ملکی خۆی ئینجا مرد، ئەو شتە دۆزراوەیە بە میراتەکەیەوە نابەسترێ، بەڵام ئەگەر مردووەکە ماڵێك، یان قەرزی کەسێکی ونبووی لەسەر بوو، لە دۆزینەوەیشی بێ ئومێد بووین، ئەوە بە میراتەکەیەوە دەبەسترێ، کەوابوو: ئەگەر قازیيەکی ئەمین هەبوو، ئەوە مەسەلەکە دەدرێتە دەست قازیيەکە، ئەگەر نا: دەدرێتە دەست پیاوێکی باوەڕ پێکراوو لێزان، تاکو ئەندازەی قەرزەکە لە میراتەکە بفرۆشێو بۆ (بَيْتِ الْمَالِ) سەرفی بکا، یان میراتگرەکە بەخۆی ئەو کارە جێبەجێ دەکاو، بۆ هەژارانو بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی دەکا، واتە: تا ئەو کارە ئەنجام نەدا دەستکاریی لە میراتەکەدا دروست نابێ، بەڵام دووریش نیە مەسەلەی قەرزی ئەو ونبووەش وەك یەتیمی بێ سەرپەرشتکار بێ، واتە: پیاو ماقوڵانی شوێنەکە جێبەجێ کردنی ئەو فرۆشتنو سەرف کردنە بخەنە ئەستۆی خۆیان.

إلاَّ إذا أعْتَــــق وهُـــوَ مُوسِـــــرُ ٣٠ فإنَّــــهُ يَنْفُــــذُ مَــــا يُحَـــــرِّرُ
أمَّــا إذا تَصَــرُّفٌ مِنْـــــهُ جَـــرَى ٣١ ولَــمْ يَكُــنْ إذْ ذَاكَ دَيْــنٌ فَطَـــــرَا
بـــــالرَّدِّ بِـــالعَيْبِ أوِ الـــــتَّرَدِّي ٣٢ فِـــي بِـئْرِ عُـدْوانٍ مَــعَ التَّــــأدِّي
لِتَلَــفٍ، فَنـــــافِذاً قَــــدْ رَسَــــخا ٣٣ إنْ أُدِّيَ الدَّيْـــــنُ وَإلاَّ فُســــــخَا

---

**دووەم:** بۆمان ئاشكرا بوو: ئەگەر مارەیی ژنەكــەی نــەدابێ، واجبــە: -وەك قــەرزەكانی تری ئادەمیزادان- پێش بەشكردنی میرات مارەییەكــە بدرێ، هــەروەها پێش مــارەیی دانیش واجبــە: قــەرزەكانی خــوای گــەورە بدرێنــەوە: وەك ئــەو زەكاتــەی لــە ئەســتۆی مردووەكە دایە بدرێ‌و، نەزرو كەففارەتەكانی بدرێن‌و، ئەگەر لــە ژیانیــا حــەجی لەســەر واجب بووبێ، واجبە: حەجی بۆ بكرێ -هەروەك چەند زانایەك وەهایان فەرمووە- یان كرێی حەج بۆ كردنی تەسـلیمی یەكێك بكرێ تـاكو حـەجی بـۆ بكـا، هـەروەك چـەند زانایەكی تر وەهایــان فــەرمووە، واتــە: تــا ئــەو مافانــەی ڕابــردوو -گشتی- جێبــەجێ دەكرێن میراتگرەكە لە دەستكاری میراتەكە قەدەغــە دەكــرێ، هــەروەك لــە (تحفــة) لــە كۆتایی (رهن)دا ناوەڕۆكی ئەم ئاگاداری‌یە ڕوون كراوەتەوە. (إلاَّ إذَا أعْتَقَ وهُــوَ مُوسِـرُ) بەڵام ئەگەر میراتگرێكی هەبوویی كۆیلەیەك لە میراتەكە ئازاد بكا (فَإنَّهُ يَنْفُذُ مَــا يُحَـرِّرُ) ئەو ئازاد كردنەی جێبەجێ دەبێ‌و نرخی كۆیلەكەش دەداتە خاوەن قەرزەكان.

**ئینجا بزانە:** بۆ میراتگرەكە دروستە: خودی میراتەكە بۆ خـۆی بگرێتــەوەو، لــە مــاڵی خــۆی قــەرزەكانی مردووەكــە بداتــەوە، وە هــەر مــیراتگرێكیش -بــە گوێــرەی بەشــە میراتەكەی خۆی- بەشە قەرزەكە بداتــەوە، ئــەوە بەشــە میراتەكــەی وی لــە بارمتــەیی بەرهــەڵ دەبــێ‌و، دروســتە: دەســتكاری بەشــەكەی خــۆی بكــا، هــەروەك لــە (تحفـــة)دا فەرموویەتی (أمَّا إذا تَصَرُّفٌ مِنْهُ جَرَى) بەڵام ئەگەر میراتگرەكە دەستكاری میراتەكەی كرد (ولَمْ يَكُنْ إذْ ذَاكَ دَيْنٌ) لە كاتی دەستكاری‌یەكەش هیــچ قــەرزێك لەســەر مردووەكــە دیــار نــەبوو (فَطَـرَأ بِـالرَّدِّ بِـالعَيْبِ) ئینجـا قــەرزێك پــەیدا بــوو: بــە هــۆی گەڕاندنــەوەی فرۆشراوێك كە پێش مردن فرۆشتبووی‌و، دوای مردن بــە هــۆی عــەیبێك گــەڕاندراوە (أوِ التَّرَدِّي فِي بِئْرِ عُدْوانٍ) یان وەكو یەكێك لە دوای مردنــی بكەوێتــە نــاو بــیرێك كــە پێش مردنی بە دوژمنكاری هەڵیكــەندبێ (مَعَ التَّـأدِّي لِتَلَـفٍ) كەوتووەكــەش لــە دوای مردنــی هەڵكەنەكە بەهۆی كەوتنە ناو بیرەكە بمرێ، ئەو كاتە (فَنافِذاً قَدْ رَسَـخا) دەسـتكاری‌ی میراتگرەكە جێبەجێ دەبێ (إنْ أُدِّيَ الدَّيْنُ) بەو مەرجەی قەرزەكەو، تۆڵەی كەوتووەكە

الإِرْثُ إِمَّـــا بِقَرابَـــةٍ عَلَـــــى ٣٤ تَفْصِيلِـــــهَا أَوْ بِنِكَـــــاحٍ أَوْ وَلا

---

درابێ: لەلایەن میراتگرەکەوە، یان لە لایەن کەسێکی ترەوە (وَإِلاَّ فُسِـخَا) بـەڵام ئەگـەر هیچیان نەدران ئەو کاتە دەستکاری‌یەکە هەڵدەوەشـێندرێتەوە، تـاکو خـاوەن مافەکـە بگاتە مافی خۆی.

## ﴿هَذا بَيانُ أَسْبابِ الإِرْثِ وَعَدَدِ الوَرَثَةِ وَذَوِي الأَرْحامِ: ئەمە ڕوونکردنەوەی هۆیەکانی میرات گرتن‌و، ژمارەی میراتگرەکان‌و، خاوەن ڕەحمەکانە﴾

(اَلإِرْثُ) **هۆیەکانی** میرات گرتن چوارن، **یەکەم:** (إِمَّا بِقَرابَةٍ عَلَى تَفْصِيلِهَا) یـان بـە هـۆی خزمایەتی‌یە: کـە لـەم باسـەدا درێـژەی پـێ دەدرێ. **دووەم:** (أَوْ بِنِكَاحٍ) یان بە هـۆی مارەبڕینێکی دروست‌و دامەزراوە: بە گوێـرەی شـەریعەتی ئیسـلام، کەواتـە: بـە تـەنـها مارەبڕین ژن‌و مێرد میرات لە یەکتری دەگرن، هەرچـەند مێردەکـەش جیمـاعی لەگـەڵ ژنەکەی نەکردبێ، یان هەر هیچێکیان بلۆغیان نەبووبێ. **سێیەم:** (أَوْ وَلا) یان بـە هـۆی سەرپەرشـتکاریەتی ئـازاد کردنـی کۆیلەیـە، کەوابوو: ئـازاد کەرەکـە مـیرات لـە ئـازاد کراوەکە دەگرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە نابێ. **چـوارەم:** (أَوْجِهَـةِ الإِسْـلاَمِ) یان بـە هـۆی لایەنی ئیسلامەتی‌یە، کەوابوو: میراتی مردووی موسوڵمان، بۆ (بَيْـتِ المَـالِ)ی ئیسـلام سـەرف دەکرێ بـە نـاوی مـیرات، –نـەك بـە نـاوی بـەرژەوەندی– ئەگـەر مـردوە موسوڵمانەکە هیچ میراتگرێکی –بەو هۆیانەی ڕابردوو– نەبێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿أَنا وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ أَعْقِلُ عَنْهُ وَأَرِثُهُ﴾ صححه ابـن حبـان، مـن مـیراتگری ئـەو کەسەم کە هیچ مـیراتگرێکی نیـە، مـن خوێنـی بـۆ ئـەدەم‌و مـیراتی لێ دەگـرم. **ئینجـا بزانە:** ئەگەر مردووێکی کافر هیچ مـیراتگرێکی نـەبێ، ئـەوە میراتەکـەی وی بـە نـاوی (فَيْء) بۆ (بَيْتِ المَالِ)ی ئیسلام سەرف دەکرێ –نەك بە ناوی میرات– **هەروەها** بزانـە: لەو حاڵەتەی میراتەکە بە ناوی میرات بدرێتە (بَيْتِ المَالِ)، دروسـت نیـە: بەشـی کـافرو مرۆڤکوژو کۆیلەی لێ بدرێ، هەروەك لە (تحفه)و (مغنی)دا فەرموویانە.

**﴿ئاگاداری﴾**: مەرجەکانی میراتگرتن چوارن، **یەکـەم:** بێگومـان میراتدەرەکـە مردبـێ، یان لـە لایـەن قـازی بڕیـاری مردنـی درابـێ: بـە گوێـرەی شـەریعەتی ئیسـلام. **دووەم:** بێگومان میراتگرەکە زیندوو بێ لە کاتی مردنی میراتدەرەکە، هەرچەند تەنها بە ماوەی

چاو لێکردنێکیش بێ. **سێیەم:** بە یەکێك لەو هۆیانەی ڕابردوو میراتگرەکە بگاتەوە مردووەکە. **چوارەم:** بە درێژی هۆی میراتگرتنەکە بزاندرێ، جا ئەم مەرجە تایبەتە بە قازی، واتە: نابێ شاهیدی لەو کەسە وەربگرێ کە تەنها بڵێ: فلانکەس میراتگری فلانکەسەو، هۆیەکەیشی نەڵێ، هەروەك لە (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿باسی ژمارەی میراتگرەکان﴾

**پێشەکی بزانە:** سەرجەم میراتگرەکان –نێرو، مێ– دوو جۆرن، **یەکەم:** (ذُو الفَرْضِ) واتە: خاوەن بەش، کە لە شەریعەتی ئیسلامدا بەشی بۆ دیار کراوەو، لە (فَصْل)ی داهاتوودا ڕوون کراوەتەوە. **دووەم:** (عَصَبَة)، واتە: خزمی لە پشتێ، بەڵام لە باسی میراتدا مەبەست ئەو میراتگرەیە: کە لە شەریعەتی ئیسلامدا بەشی بۆ دیار نەکرابێ، هەروەك لە باسی (بێ بەشکردن لە میرات)دا ڕوونی دەکەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تَعَالَى، جا لە دروست کردنی مەسەلەکاندا ئێمە بە (پشتێیە) ناوی دێنین، **ئینجا بزانە:** جگە لە خزمەکانی میراتگر خزمەکانی تر پێیان دەگوترێ (ذَوِی الأَرْحَام)، واتە: خاوەن ڕەحم، هەروەك لە کۆتایی ئەم باسەدا ڕوون کراونەوە.

(وَالْمُجْمَعْ عَلَى تَوْرِيثِهِ مِنَ الذُّكُورِ) ئەو میراتگرانەی بە (إِجْمَاع)ی زانایانی ئیسلام میرات دەگرن: لە چینی نێرینەکان (هَؤُلاء) ئەم دە کەسانەن، **یەکەم:** (إِبْنٌ) کوڕی مردووەکە، **دووەم:** (مَعَ ابْنِهِ) کوڕی کوڕی مردووەکە (وَلَوْ مُسْتَفِلاً) هەرچەند کوڕی کوڕ بەرەو خوارەوەش بێ: وەك کوڕی کوڕی کوڕ...هتد، بەو مەرجەی بە پوختەی نێرینەکان بگاتەوە مردووەکە؟ چونکە کوڕی کیژی مردووەکە میراتگر نیە، هەروەك لە (مغنی)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە. **سێیەم:** (وَالأَبُ) باوکی مردووەکە. **چوارەم:** (مَعْ أَبِي أَبٍ) باوکی باوکی مردووەکە، واتە: باپیرە (وَإِنْ عَلاَ) هەرچەند باپیرەکە بەرەو سەرەوەش بێ: وەك باوکی باوکی باوك...هتد، بەو مەرجەی بە پوختەی نێرینەکان بگاتەوە مردووەکە؟ چونکە باوکی دایك میراتگر نیە، هەروەك لە (القليوبی)و (البجيرمی)دا ڕوون کراوەتەوە.

**پێنجەم:** (وَالأَخُ) برای مردووەکە، جیاوازی نیە برایەکە: لە دایكو باوکی بێ، یان تەنها لە دایکی بێ، یان تەنها لە باوکی بێ. **شەشەم:** (وَالزَّوْجُ) مێردی مردووەکە. **حەوتەم:**

وَالأَخُ وَالـزَّوْجُ وَذُو الـوَلاَ وَعَـمّْ ٣٧ وَإبْـنٌ لَـهُ وَابْـنُ أَخٍ لِغَـيْرِ أُمّْ
وَمِـنْ إنـاث زَوْجَـةٌ وَبِنْـتُ ٣٨ وَالِـدَةٌ ذَاتُ وَلاَءٍ أُخْـتُ
وَجَـدَّةٌ وَبِنْـتُ الاِبْـنِ لَـوْ نَـزَلْ ٣٩ إنِ اجْتِمـاعٌ لِذُكُورِهِـمْ حَصَـلْ

---

(وَذُو الوَلَاءِ) ئازاد كەری كۆیلە مردووەكە. **هەشتەم:** (وَعَمّ) مامی مردووەكە، **هە**رچەند دووریش بێ: وەك مامی باوكی مردووەكە، یان مامی باپیرەی مردووەكە، بەو مەرجەی مامەكە: لە دایكو باوكی بێ، یان تەنها لە باوكی بێ؟ چونكە مامی تەنها لە دایكی میراتگر نیە، **هە**روەك لە (تحفه)و (مغنی)دا فەرموویانە. **نۆیەم:** (وَإبْنٌ لَهُ) كوڕە مامی مردووەكە، ئەویش بەو مەرجەی كوڕە مامی تەنها لە دایكی نەبێ، بەڵكو كوڕە مامی لە دایكو باوكی بێ، یان تەنها لە باوكی بێ، **هە**رچەند دووریش بێ: وەك كوڕی كوڕی مامی مردووەكە...**هتد**، **هە**روەك لە (شَرح المَنْـهَج)دا فەرموویەتی. **دەیەم:** (وَابْنُ أَخٍ) كوڕە برای مردووەكە: كە (لِغَيْرِ أُمّ) كوڕی برای تەنها لە دایكی نەبێ؟ چونكە كوڕە برای تەنها لە دایكی میراتگر نیە، بەڵكو مەرجە كوڕی برای لە دایكو باوكی بێ، یان كوڕی برای تەنها لە باوكی بێ، **هە**رچەند كوڕە برایەكەش بەولاوە تر بێ: وەك كوڕی كوڕی برای مردووەكە...**هتد**، **هە**روەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی.

(وَمِنْ إناثٍ) ئەو میراتگرانەی بە (إجْماع)ی زانایانی ئیسلام میرات دەگرن لە چینی مێیینە، ئەم حەفت كەسانەن، **یەكەم:** (زَوْجَةٌ) ژنی مردووەكە. **دووەم:** (وَبِنْتٌ) كیژی مردووەكە. **سێیەم:** (وَالِدَةٌ) دایكی مردووەكە. **چوارەم:** (ذَاتُ وَلَاءٍ) ئازاد كەری كۆیلە مردووەكە. **پێنجەم:** (أُخْتٌ) خوشكی مردووەكە، جیاوازی نیە خوشكەكە: لە دایكو باوكی بێ، یان تەنها لە دایكی بێ، یان تەنها لە باوكی بێ. **شەشەم:** (وَجَدَّةٌ) داپیرەی مردووەكە لە **هە**ردوولاوە، واتە: دایكی دایكو بەسەرەوەو، **هە**م دایكی باوكو بەسەرەوە، بەو مەرجەی داپیرەكە بە **هۆ**ی میراتگرێكەوە بگاتەوە مردووەكە، **هە**روەك لە (تحفه)و (مغنی) لە باسی میراتی دایكو باوكدا ڕوون كراوەتەوە. **حەوتەم:** (وَبِنْتُ الاِبْنِ) كیژی كوڕی مردووەكە (لَوْ نَزَلْ) **هە**رچەند كوڕی مردووەكە بەرەو خوارەوەش بێ: وەك كیژی كوڕی كوڕ...**هتد**، بەو مەرجەی بە پوختەی نێرینەكان بگاتەوە مردووەكە؟ چونكە كیژی كیژی كوڕ میراتگر نیە، **هە**روەك لە (تحفه)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(إنِ اجْتِماعٌ لِذُكُورِهِمْ حَصَلْ) ئەگەر تەنها **هە**موو ئەو نێرینانەی ڕابردوو كۆبوونەوە – لەو حاڵەتەی كە مردووەكە ئافرەتە– ئەو كاتە (فَالْوَارِثُ الْحَلِيلُ وَابْنٌ وَأَبٌ) میراتگر

فَـالْوَارِثُ الْحَلِيـــلُ وَابْــنٌ وَأَبُ ٤٠ إِذْ غَـيْرُهُمْ بِغَـيْرِ زَوْجٍ يُحْجَبُ
أَوْ لِلإِنَـاثِ فَابْنَـةُ ابْنٍ وَأُخْـتٌ ٤١ لأَبَوَيْـنِ زَوْجَـةٌ وَبِنْـتٌ
وَالأُمُّ،أَوْلِمُمْكِنٍ مِـنْ ذَيْـنِ ٤٢ فَـابْنٌ وَبِنْـتٌ أَحَـدُ الزَّوْجَيْـنِ

---

تەنها مێردو کوڕو باوکە (إِذْ غَيْرُهُمْ بِغَيْرِ زَوْجٍ يُحْجَبُ) چونکە میراتگرەکانی تر بەجگە لە مێرد بێ بەش دەبن، واتە: باپیرە بە باوك بێ بەش دەبێ‌و، کوڕی کوڕ بە کوڕ بێ بەش دەبێ‌و، براو برازاو مامو مامۆزاو ئازاد کەر بە کوڕەکەو هەم بە باوکیش بێ بەش دەبن، جا لەم حاڵەتەدا شەشێکی میراتەکە بۆ باوك‌و، چوارێکی بۆ مـێردو، پاشماوەکـەش بـۆ کوڕەکەیە، کەوابوو: بنچینەی مەسەلەکەیان لە دوانزەیە بە لێدانی سێ لـە چـوار، بـەم شێوەیە:

٤، میراتگر ـــــ باوك، مێرد، کوڕ
٣ × بەشە میرات ـــــ شەشێك، چوارێك، پشتێیە
١٢ ÷ ـــــــــــ ٢ + ٣ + ٧ = ١٢

(أَوْ لِلإِنَاثِ) یان ئەگەر تەنها هەموو ئەو مێیینانەی ڕابردوو کۆبوونەوە ـلـەو حاڵەتـەی مردووەکە نێرینەیە ـ ئەو کاتە (فَابْنَةُ ابْنٍ وَأُخْتٌ لأَبَوَيْنِ زَوْجَةٌ وَبِنْتٌ وَالأُمُّ) میراتگر تـەنها کیژی کوڕو خوشکی لە دایکی‌و باوکی‌و ژن‌و کیژو دایکە، چونکـە داپـیرە بـە دایـك بـێ بەش دەبێ‌و، خوشکی تەنها لە دایکی بە کیژەکە بێ بەش دەبێ‌و، ئازاد کەرو خوشکی تەنها لە باوکی بە خوشکی لە دایکی‌و باوکی بێ بـەش دەبـن، چونکـە خوشـك لەگـەڵ کیـژدا بـە مـیراتگری پشـتێ دادەنـدرێ، جا لـەم حاڵەتـەدا شەشـێك بـۆ کیـژی کـوڕو، هەشـتێك بـۆ ژن‌و، نیوە بـۆ کیـژو، شەشـێکێکی‌تر بـۆ دایـك‌و، پاشماوەکـەش بـۆ خوشکەکەیە، کەوابوو: بنچینەی مەسەلەکەیان لـە بیسـت‌و چوارە بـە لێدانـی سـێ لـە هەشت، بەم شێوەیە:

٨، میراتگر ـــــ کیژی کوڕ، ژن، کیژ، دایك، خوشکی لە دایك‌و باوکی
٣ × بەشە میرات ـــ شەشێك، هەشتێك، نیوە، شەشێك، پشتێیە
٢٤ ÷ ـــــــــــ ٤ + ٣ + ١٢ + ٤ + ١ = ٢٤

(أَوْلِمُمْكِنٍ مِنْ ذَيْنِ) یان لەو میراتگرانەی ڕابردوو هەموو ئەوانە کۆبوونەوە، کـە دەگونجـا وێکڕا کۆببنەوە لە هەردوو جۆرەکەی نێرینـەکان‌و مێیینـەکان، ئەوکاتـە (فـابْنٌ وَبِنْـتٌ) کوڕو کیژو، هەم (أَحَدُ الزَّوْجَيْنِ) یەکێك لە ژنەکەو مێردەکەو، هەم (أَصْلاَنِ) دایك‌و باوك میراتگرن، جا ئەگەر مێردەکە مردبێ: ئەوە هەشتێکی میرات بـۆ ژنەکەیـەو، شەشـێکی

أَصْلاَنِ، ثُـــمَّ حَيْـــثُ لَـــمْ تَسْـــتَغْرِق ٤٣ وَرَثَـــةٌ فَكُلُّــــــها أَوْ مَـــا بَقِـــي
لِبَيْـتِ مَـــــالٍ إِذْ لَــــهُ انْتِظـــامُ ٤٤ بِـــأَنْ يَكُـــــونَ عَـــدْلاً الإِمـــامُ
وَإِنْ تَجِـــدْ نِظَامَـــهُ مُخْتَـــــلاَّ ٤٥ فَارْدُدْ عَلَى أَهْـــلِ الفُـرُوضِ فَضْـــلاَ

---

بۆ بـاوكو، شەشـێكێكی تـر بـۆ دایـكو، پاشماوەكـەش بـۆ كـوڕو كیژەكەیـە، كـەوابوو: بنچینەی ئەم مەسەلەیە لە بیستو چوارە بە لێدانی سێ لە هەشـت، بـەڵام لـە حـەفتاو دوو ساغ دەبێتەوە بە لێدانی سێ –كە ژمارەی سەری كوڕەكەو كیژەكەیە– لە بیستو چوار، بەم شێوەیە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٨، | میراتگر ——— | ژن، | دایك، | باوك، | كوڕو كیژ |
| ٣ × | بەشە میرات ——— | هەشتێك، | شەشێك، | شەشێك، | پشتێنە |
| ÷ ٢٤ | ——————— | ٣ + | ٤ + | ٤ + | ١٣ = ٢٤ |
| ٣ × | ——— ساغكردنەوەی بە سێ هاوبەش | | | | |
| ÷ ٧٢ | ——————— | ٩ + | ١٢ + | ١٢ + | ٣٩ = ٧٢ |

وە ئەگەر ژنەكە مردبێ: ئـەو كاتـەش دایـكو بـاوك –وەك مەسـەلەكەی ڕابـردوو– هـەر یەكـەو شەشـێكێك وەردەگـرنو، چوارێكـیش بـۆ مێردەكـەو، پاشماوەكـەش بـۆ كـوڕو كیژەكەیە، كەوابوو: بنچینەی ئەم مەسەلەیە لەدوانزەیە بە لێدانی سێ لە چـوار، بـەڵام لە سێو شەش ساغ دەبێتەوە بە لێدانی سێ –كە ژمارەی سەری كوڕەكەو كیژەكەیە– لە دوانزە، بەم شێوەیە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٤، | میراتگر ——— | مێرد، | دایك، | باوك، | كوڕو كیژ |
| ٣ × | بەشە میرات ——— | چوارێك، | شەشێك، | شەشێك، | پشتێنە |
| ÷ ١٢ | ——————— | ٣ + | ٢ + | ٢ + | ٥ = ١٢ |
| ٣ × | ——— ساغكردنەوەی بە سێ هاوبەش | | | | |
| ÷ ٣٦ | ——————— | ٩ + | ٦ + | ٦ + | ١٥ = ٣٦ |

(ثُمَّ حَيْثُ لَمْ تَسْتَغْرِقِ وَرَثَةٌ) ئینجا ئەگەر میراتگرەكان –لـە جـۆری نێرو، مـێ– هـەموو میراتەكەیان نەبرد، یان هەر هیچ میراتگرێك نەبوو، ئەو كاتە (فَكُلُّها) گشت میراتەكـە –ئەگەر هیچ میراتگرێك نەبێ– (أَوْ مَا بَقِي) یان ئەوەندەی لـە دوای بەشـی میراتگرەكـان ماوەتەوە –ئەگەر میراتگر هەبن بەڵام لە پشتێیان لەگەڵدا نەبێ– لـە هـەردوو حاڵـەتدا میراتەكە (لِبَيْتِ مـالٍ) بـۆ (بَيْـتِ الْمَـال) سـەرف دەكـرێ (إِذْ لَـهُ انْتِظـامُ) بـەو مەرجـەی كاروباری (بَيْت الْمَال) ڕێكو پێك بێ (بِأَنْ يَكُونَ عَدْلاً الإِمـامُ) وەك پێشـەوا دادپـەروەرو لێزان بێو لە بـەرژەوەندی موسـوڵمانان سـەرفی بكـا. بـەڵام (وَإِنْ تَجِدْ نِظَامَـهُ مُخْتَـلاًّ) ئەگەر دەبینی كاروباری (بَيْت الْمَال) نارێكە چونكە پێشەوای موسـوڵمانان نـەبوو، یـان

بِنِسْبَةِ الفُرُوضِ قَصْدَ الْعَدْلِ ٤٦ غَيْرَ حَلِيلَةٍ وَغَيْرَ بَعْلِ
إِنْ كَانَ كُلُّ مَنْ لَهُ فَرْضٌ عُدِمْ ٤٧ وَجَبَ صَرْفُهَا إِلَى ذَوِي الرَّحِمْ

---

ستەمكار بوو –وەك سەردەمی ئێستا– ئەو كاتە (فَارْدُدْ عَلَى أَهْلِ الفُرُوضِ فَضْلاً) میراتە زێدەكە دووبارە بگەڕێنەوە بۆ خاوەن بەشەكان لەو حاڵەتەی كە هیچ میراتگرێكی لە پشتێ نیە (بِنِسْبَةِ الفُرُوضِ قَصْدَ الْعَدْلِ) هەر یەكەیان بە گوێرەی بەشە میراتەكەی خۆیان بە مەبەستی دادپەروەری، هەروەك لە كۆتایی (ساغكردنەوەی مەسەلەكان)دا بە درێژی ڕوونی دەكەینەوە، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى (غَيْرَ حَلِيلَةٍ وَغَيْرَ بَعْلِ) جگە لە ژن و مێرد، واتە: هیچ بەشێكی میراتە زیادەكە دووبارە بەسەر ژن و مێرددا بەش ناكرێتەوە، چونكە ئەو دووانە خزمی بە ڕەحمێ نین (إِنْ كَانَ كُلُّ مَنْ لَهُ فَرْضٌ عُدِمْ) جا ئەگەر هیچ خاوەن بەشێكیش نەبوو، ئەو كاتە (وَجَبَ صَرْفُهَا إِلَى ذَوِي الرَّحِمْ) واجبە: میراتەكە –بە ناوی میرات– بدرێتە (ذَوِى الأَرْحام)، واتە: خزمە خاوەن ڕەحمەكانی داهاتوو، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿الْخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ﴾ حديث صحيح رواه أبو داود وغيره، خاڵ میراتگری ئەو كەسەیە: كە هیچ میراتگرێكی نیە.

﴿**ئاگاداری**﴾: ئەوەی ڕابردوو فتوای كۆمەڵە زۆرەكەی زانایانی مەزهەبی (الشافعی) بوو، زانایانی لێكۆڵەرەوەش ئەو فتوایەیان بە ڕاستتر داناوە، كەوابوو: دەبێ ڕەفتار هەر بەو فتوایە بكرێ، جا ئەگەر مردووەكە هیچ میراتگرێكی نەبوو و هیچ خزمێكی (ذَوِى الأَرْحام)شی نەبوو، ئەو كاتە واجبە: میراتەكە بدرێتە دەست كار بە دەستێكی ئەمین و باوەڕ پێكراوی شوێنەكە، تاكو لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی بكا، جا ئەگەر كاربە دەست لەو شوێنەدا نەبوو، یان خائین و لێنەزان بوو، ئەو كاتە ئەو كەسەی میراتەكەی لە بەردەست دایە بۆی دروستە، بەڵكو واجبە: هەر بە خۆی لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی بكا، جا ئەگەر بە خۆی نائەمین بوو، یان لێنەزان بوو، ئەو كاتە واجبە: بیداتە دەست یەكێكی ئەمین و لێزان تاكو ئەو لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی بكا، جا لەو دوو حاڵەتەدا مەرجە: دوا ڕۆژی ئەو دەستكاریە سەلامەت بێ و تووشی ئاژاوە نەبێ، هەروەك لە (تحفە)و (نهایة)و (حاشیة)كانیاندا ناوەڕۆكی ئەم ئاگاداریە ڕوون كراوەتەوە.

وَهُـمْ سِـوَى الوَرَثَـةِ الْمُقَـرَّرَةْ ٤٨ وَوَاحِـدٌ أَصْنَافُـهُمْ مَـعْ عَشَـرَةْ
خَـالٌ وَخَالَـةٌ وَجَـدَّةٌ وَجَـدْ ٤٩ قَـدْ سَـقَطَا عَـمٌّ لأُمٍّ وَوَلَـدْ
أُخْـتٍ وَعَمَّـةٌ وَبِنْـتُ عَـمِّ ٥٠ بِنْـتُ أَخٍ وَابْـنُ أَخٍ لأُمِّ
وَوَلَـدُ البِنْـتِ وَمُدْلُـونَ بِـهِمْ ٥١ فَـهَذِهِ عِـدَّةُ أَصْحَـابِ الرَّحِـمْ
وَحَـازَ كُـلَّ الْمَـالِ مَـنْ يَنْفَـرِدُ ٥٢ مِنْـهُمْ، وَإِنْ وُجِـدَ مِنْـهُمْ عَـدَدُ

---

## ﴿باسی (ذوی الأرحام)و چۆنیەتی میراتگرتنیان﴾

(وَهُمْ) خزمەکانی (ذَوِی الأرْحَام) لە شەرعدا (سِوَى الوَرَثَةِ الْمُقَرَّرَةْ) خزمەکانی ترن جگە لەو حەقدە میراتگرانەی ڕابردوو: کە بڕیاری میراتیان بۆ دراوە (وَوَاحِدٌ أَصْنَافُهُمْ مَعْ عَشَرَةْ) خزمەکانی (ذَوِی الأرْحَام) یازدە جۆرن، **یەکەم:** (خَالٌ) خاڵی مردووەکە. **دووەم:** (وَخَالَةٌ) پوری مردووەکە: کە خوشکی دایکی بێ. **سێیەم:** (وَجَدَّةٌ وَجَدٌّ قَدْ سَقَطَا) گشت داپیرەو باپیرەیەکی بێ بەش لە میرات: وەك دایکی باوکی دایكو باوکی باوکی دایك. **چوارەم:** (عَمٌّ لأُمٍّ) مامی لە دایکی کە تەنها لە دایکە وە برای باوکی مردووەکە بێ. **پێنجەم:** (وَوَلَدُ أُخْتٍ) کوڕو کیژی خوشك: جا خوشکی لە دایكو باوکی بێ، یان تەنها لە باوکی، یان تەنها لە دایکی. **شەشەم:** (وَعَمَّةٌ) پوری مردووەکە: کە خوشکی باوکی بێ. **حەوتەم:** (وَبِنْتُ عَمٍّ) کیژە مام: جا مامی لە دایكو باوکی بێ، یان تەنها لە باوکی، یان تەنها لە دایکی، **هەروەها** کوڕە مامی تەنها لە دایکی وەکو کیژە مامە. **هەشتەم:** (بِنْتُ أَخٍ) کیژە برا: جا برای لە دایكو باوکی بێ، یان تەنها لە دایکی، یان تەنها لە باوکی. **نۆیەم:** (وَابْنُ أَخٍ لأُمٍّ) کوڕی برای تەنها لە دایکی، **هەم** کیژەکەیشی هەروەك ڕابرا، **دەیەم:** (وَوَلَدُ البِنْت) کوڕو کیژی کیژ: جا کیژەکەی خۆی بێ، یان کیژەکەی کوڕی بێ. **یازدەم:** (وَمُدْلُونَ بِهِمْ) ئەو خزمانەی بەو دە جۆرانەش دەگەنەوە مردووەکە (فَهَذِهِ عِدَّةُ أَصْحَابِ الرَّحِمْ) ئەمە ژمارەی خزمەکانی خاوەن ڕەحمە.

**ئینجا بزانە:** چۆنیەتی میراتگرتنی (ذَوِی الأرْحَام) سێ حاڵەتی هەیە، **حاڵەتی یەکەم:** حاڵەتی بە تەنهایی، **هەروەك** دەفەرموێ: (وَحَازَ كُلَّ الْمَالِ مَنْ يَنْفَرِدُ مِنْهُمْ) هەر یەکێك لە خزمەکانی (ذَوِی الأرْحَام) بە تەنها بێ، ئەوە گشت میراتەکە دەگرێ، جیاوازی نێرو مێ نیە، بۆ وێنە: ئەگەر مردووەکە تەنها کیژە برایەکی **هەبێ:** ئەوە میراتەکەی گشتی دەدرێتە کیژە برایەکە، یان ئەگەر تەنها کیژە مامێکی **هەبێ**، ئەوە میراتەکەی گشتی بۆ کیژە مامەکەیە، **هەروەك** لە (تحفة)و (الشروانی)دا فەرموویانە.

فَمَذْهَبَيْنِ فِيهُمُ قَدْ نَقَلُوا ٥٣ أَهْلَ قَرَابَةٍ وَمَنْ يُنَزِّلُ
وَالْمَذْهَبُ الأَصَحُّ أَنَّ كُلاَّ ٥٤ كَأَصْلٍ أَوْ فَرْعٍ بِهِ قَدْ أَدْلَى
فِي الإِرْثِ وَالحَجْبِ وَلَكِنْ حُسِبَا ٥٥ اَلْعَمُّ لِلأُمِّ وَعَمَّةٌ أَبَا
وَالْخَالُ وَالْخَالَةُ مِثْلَ الأُمِّ ٥٦ وَكَهُمُ أَوْلاَدُهُمْ فِي الْحُكْمِ

---

بەڵام (وَإِنْ وُّجِدَ مِنْهُمْ عَدَدٌ) ئەگەر لە خزمەكانی (ذَوِي الأَرْحَام) ژمارەیەك هەبوون، ئەو كاتە (فَمَذْهَبَيْنِ فِيهُمُ قَدْ نَقَلُوا) دوو مەزهەبیان لە بارەی میراتگرتنیان گێڕاونەوە،
**یەكەم:** مەزهەبی (أَهْلَ قَرَابَةٍ) كە مەزهەبێكی بێ هێزەو دەفەرموێ: میراتەكە دەدرێتە ئەو كەسەیان كە لە مردووەكە نزیكترە، هەروەك لە خزمەكانی پشتێش ئەوهایە.
**دووەم:** (وَمَنْ يُنَزِّلُ) مەزهەبی (أَهْلِ التَّنْزِيل): كە مەزهەبێكی ڕاسترەو دەفەرموێ: هەر یەكێك لە خزمەكانی (ذَوِي الأَرْحَام) دەهێندرێتە شوێن ئەو میراتگرەی كە بەویەوە دەگاتەوە مردووەكە، هەروەك لە حاڵەتی دووەم‌و سێیەمدا ڕوونی دەكەینەوە إن شاء الله تعالى.
ئینجا (وَالْمَذْهَبُ الأَصَحُّ) مەزهەبی ڕاستتری كارپێكراو ئەم دووەمەیە، كەوابوو: (أَنَّ كُلاَّ) هەر یەكێك لە خزمەكانی (ذَوِي الأَرْحَام) بۆ میراتگرتن (كَأَصْلٍ أَوْ فَرْعٍ بِهِ قَدْ أَدْلَى) وەكو ئەو بنچینە، یان ئەو لقەیە: كە بەویەوە دەگاتەوە مردووەكە (فِي الإِرْثِ) لە ڕووی میراتگرتن‌و (وَالحَجْبِ) لە ڕووی بێ بەشبوون‌و بێ بەشكردنی یەكترییان، واتە: بەڵام خزمەكانی (ذَوِي الأَرْحَام) ناتوانن بەشی میراتگرەكانی خاوەن بەش -كە ژن، یان مێردە- كەم بكەنەوە، بۆ وێنە: ئەگەر مردووەكە تەنها ژنێك‌و كیژێكی كیژی لە پاش بەجێمان، ئەوە ژنەكە چوارێكی میراتەكەی بە تەواوی دەدرێتێ‌و، سێ چوارێكەكەی تریش بۆ كیژی كیژەكەیە، واتە: بە هۆی كیژی كیژ بەشی ژنەكە كەم نابێتەوە بۆ هەشتێك، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا ڕوون كراوەتەوە.
ئینجا كیژو كوڕی كیژو، هەم كیژو كوڕی خوشك هەر یەكەیان وەكو دایكی خۆیەتی‌و، هەروەها كیژی براو، كیژی مام هەر یەكەیان وەكو باوكی خۆیەتی (وَلَكِنْ حُسِبَا اَلْعَمُّ لِلأُمِّ) بەڵام مامی تەنها لە دایكی‌و (وَعَمَّةٌ) پور: كە خوشكی باوك بێ (أَبَا) هەردووكیان وەكو باوك ژمێردراون، جیاوازی نیە پورەكە: لە دایك‌و باوكی بێ، یان تەنها لەباوكی بێ، یان تەنها لە دایكی بێ (وَالْخَالُ وَالْخَالَةُ) هەروەها خاڵ‌و، پور: كە خوشكی دایك بێ (مِثْلَ الأُمِّ) هەردووكیان وەكو دایك ژمێردراون (وَكَهُمُ) وەك ئەو چوارانەش وایە (أَوْلاَدُهُمْ) كیژو كوڕەكانیان (فِي الْحُكْمِ) لەو بڕیارەی ڕابردوودا، واتە: ئەوانیش وەك

وَنَــزِّلِ العَــالِيَ وَارْفَـــعْ ســـافِلاً ٥٧ فَـإنْ وَجَـدْتَ بَيْنَـــهُمْ تفـــاضُلاَ
فِي القُرْبِ لِلْوارِث كَــانَ مَــنْ سَـبَقْ ٥٨ إلَيْـــهِ مِنْـــهُمُ بتَقْـــدِيمٍ أَحَـــقّ
فَـــهُوَ بَدِيـــلُ مَـــنْ بِـــهِ قَـــدْ أَدْلَـــى ٥٩ فَـــالأَخْذُ بِـــالقُرْبِ إلَيْـــهِ أَوْلَـــى
وَإنْ وَجَدْتَـــهُمْ قَـــدِ اسْـتَوَوْا فِـــي ٦٠ قُــرْبٍ إلَــى وَارِثِ مَـــــنْ تُوُفِّـــي

---

دایکی، یان باوکی ئەوانە دەژمێردرێن، کەوابوو: (وَنَزِّلِ العالِيَ) چینی سەرەوە دابەزێنە بۆ ڕیزی خوارەوە: وەك باپیرەو داپیرەی بێ بەش: بۆ ڕیزی دایك (وَارْفَعْ سافلاً) چینی خوارەوەش بەرز بکەوە بۆ ڕیزی سەرەوە: وەك کوڕو کیژی کیژەکان: بۆ ڕیزی کیژەکان، هەروەك ڕابرا، **ئینجا بزانە:** لە دوای حاڵەتی یەکەم تا ئێرە باسی ئەوە بوو: کە خزمەکانی (ذَوِي الأَرْحَام) لە یەك کەس زیاتر بن‌و لە حاڵەتی دووەم‌و سێیەمدا چۆنیەتی میراتەکەیان ڕوون دەکرێتەوەو دەفەرموێ:

**حاڵەتی دووەم:** کە لە یەك کەس زیاتر بن، ئەو کاتە (فَإنْ وَجَدْتَ بَيْنَهُمْ تَفاضُلاَ) ئەگەر بینیت لە نێوان خزمەکانی (ذَوِي الأَرْحَام)دا جیاوازی هەیە (فِي القُرْبِ لِلْوارِث) لە بارەی نزیکی لە میراتگری مردووەکەوە، ئەو کاتە (كَانَ مَنْ سَبَقَ إلَيْهِ مِنْهُمُ) ئەو خزمە (ذَوِي الأَرْحَام)ەی لە میراتگرەکەوە نزیکتر بێ (بِتَقْدِيمٍ أَحَقّ) ئەو مافی هەیە وە پێش بێخرێ بۆ میراتگرتن، نەك ئەوەی لە خودی مردووەکە نزیکترە –هەروەك لە مەزهەبەکەی بێ هێزدا ئەوهابوو– چونکە (فَهُوَ بَدِيلُ مَنْ بِهِ قَدْ أَدْلَى) نزیکترەکە لە جیاتی ئەو میراتگرەیە: کە ئەو بەویەوە دەکاتەوە مردووەکە، کەوابوو: (فَالأَخْذُ بِالقُرْبِ إلَيْهِ أَوْلَى) ڕەچاو کردنی نزیکی لە میراتگرەکە لە پێشترە لە ڕەچاو کردنی نزیکی لە خودی مردووەکە، بۆ وێنە: ئەگەر مردووەکە لە پاش بەجێما: تەنها کیژی کیژی کوڕو، کیژی کوڕی کیژ، ئەوە میراتەکە گشتی بۆ کیژی کیژی کوڕەکەیە؟ چونکە ئەمەیان بەیەك نمرە دەگاتە میراتگرەکە: کە کیژی کوڕی مردووەکەیە، بەڵام ئەوەکەی تر بە دوو نمرە دەگاتە میراتگرەکە: کە کیژی مردووەکەیە، هەروەها ئەگەر لە پاشی بەجێما: تەنها باوکی دایك‌و، دایکی باوکی دایك، ئەوە میراتەکە گشت بۆ باپیرەکەیە؟ چونکە ئەمەیان بە یەك نمرە دەگاتە میراتگرەکە: کە دایکی دایکی مردووەکەیە، بەڵام داپیرەکە بە دوو نمرە دەگاتەوە میراتگەرەکە: کە دایکی مردووەکەیە...هتد.

**حاڵەتی سێیەم:** کە لە یەك کەس زیاتر بن، جا لەو حاڵەتەدا (وَإنْ وَجَدْتَهُمْ قَد اسْتَوَوْا) ئەگەر بینیت خزمەکانی (ذَوِي الأَرْحَام) یەکسان بوون (فِي قُرْبٍ إلَى وَارِثِ مَنْ تُوُفِّي)

فَــافْرِضْ كَــأَنَّ مَــنْ أُحِــلَّ لَحْــدَهُ ٦١ عَصَابَــةً مُدْلِــينَ خَلَّــى بَعْــدَهُ
فَمَــا مِــنَ النَّصِيــبِ خُــصَّ كُـــلاَّ ٦٢ مُسَــلَّمٌ لِمَــنْ بِــهِ قَــدْ أَدْلَــى
كَإِرْثِــــهِ عُصُوبَــــةً أَوْ فَرْضَـــــا ٦٣ مِنْــهُ، وَإِنْ حَجَــبَ بَعْــضٌ بَعْضَـــا
مِمَّـــنْ فَرَضْـــتَ وَارِثِـــينَ عُمِـــلاَ ٦٤ بِالْحَجْبِ فِي الْمُدْلَى بِهِمْ مِـــنْ هَـؤُلاَ

---

له بارەی نزیکی له میراتگری مردووەکەوە، ئەو کاتە (فَافْرِضْ) وا دابنێ: (كَأَنَّ مَنْ أُحِلَّ لَحْدَهُ) ئەو کەسەی مردوە (عَصَابَةً مُدْلِينَ خَلَّى بَعْدَهُ) خودی ئەو کۆمەڵە میراتگرەی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە: کە خزمەکانی (ذَوِي الأرْحَام) بە هۆی ئەوانەوە دەگەنەوە مردووەکە، ئینجا (فَمَا مِنَ النَّصِيبِ خُصَّ كُلاًّ) ئەو بەشە میراتەی تایبەتە بە هەر یەکێك لەو میراتگرانە (مُسَلَّمٌ لِمَنْ بِهِ قَدْ أَدْلَى) تەسلیمی ئەو خزمە (ذَوِي الأرْحَام)ە دەکرێ: کە بە هۆی ئەو میراتگرەوە گەیشتۆتە مردووەکە، ئینجا ئەو بەشە میراتـەش کـە دەدرێتـە خزمـەکانی (ذَوِي الأرْحَـام)، هـەر یەکـەیان (كَإِرْثِـهِ عُصُوبَـةً أَوْ فَرْضَـا مِنْـهُ) وەکـو مـیراتگرتنی خۆیـەتی لـە خـودی ئـەو مـیراتگرە ئەگـەر وا دابنێـین خـودی میراتگرەکـە مردوە، جا میراتگرتنەکە بە ڕووی پشتێ بێ، یان بە خاوەن بەشی بێ، بۆ وێنە: ئەگەر مردووەکە لە پاشی بەجێما: تەنها کیژی کیژو، کیژی کیژی کوڕ، ئەوە نیوەی میراتەکە بۆ کیژی کیژەکەیەو، شەشێکیش بۆ کیژی کیژی کوڕەکەیـە، ئینجا پاشماوەکـەش بـە سەریاندا بەش دەکرێتەوە: سێ بەشی بۆ کیژی کیژەکـەو بەشـێکیش بـۆ کیـژی کیـژی کوڕەکە. هەروەها ئەگەر لە پاشی بەجێما: تەنها کیژی کیژێكو، کوڕو کیژێکی کیژێکـی تر، ئەوە نیوەی میراتەکە گشتی بۆ کیژی کیژەکەیەو، نیوەکەی تریش بۆ کـوڕو کیژی کیژەکەی ترە ـلـە ڕووی پشـتێ ـ واتـە: لـەم نیوەیـە کوڕەکـە دوو هـەندی کیژەکـەی دەدرێتێ، چونکە ئەگەر دایکی خۆیان مردبا: ئەوها میراتیان لێ دەگرت.

(وَإِنْ حَجَبَ بَعْضٌ بَعْضاً) ئەگەر هاتوو: هەندێکیان هـەندێکیان بـێ بـەش دەکـرد (مِمَّنْ فَرَضْتَ وَارِثِينَ) لە وانەی بە میراتگرت دانابوون، ئەوە (عُمِلاَ بِالْحَجْبِ فِي الْمُدْلَى بِهِمْ مِـنْ هَؤُلاَءِ) هەمان بێ بەشکردن ڕەفتاری پێ دەکرێ لەو خزمانەی (ذَوِي الأرْحَام)دا: کە بە هۆی ئەو میراتگرانەوە گەیاندرابوونەوە مردووەکە، **بۆ وێنە:** ئەگەر مردووەکە لە پاشی بەجێما: کیژە برایـەکی لـە دایکـیو بـاوکیو، کیـژە برایـەکی تەنـها لـە دایکیو، کیـژە برایەکی تەنها لە باوکی، ئەوە شەشێکی میراتەکە بۆ کیـژە بـرای تەنـها لـە دایکیـەو، پاشماوەکەش گشتی بۆ کیژە برای لە دایکیو باوکییەو، کیژە برای تەنها لـە بـاوکیش

وَإِنْ يَــذَرْ أَوْلَادَ فَــرْعِ أُمٍّ ٦٥ فَـأَنْتَ سَوِّ بَيْنَهُمْ فِـي القَسْمِ
أَوْ خَالَـةً وَالْخَـالَ مِنْـهَا لَزِمَـا ٦٦ تَسْوِيَةً فِـي قِسْمَةٍ بَيْنَهُمَا

هَذا بَيَانُ الفُرُوضِ الْمُقَدَّرَةِ فِى القُرْآنِ مَعَ بَيَانِ أَهْلِيهَا

ثُـمَّ الفُـرُوضُ سِـتَّةٌ، وَأَخْصَـرُ ٦٧ عِبَـارَةٍ عَنْـهَا بِـهَا يُعَـبَّرُ
اَلرُّبْـعُ وَالثُّلْـثُ وَضِعْـفُ كُـلِّ ٦٨ وَنِصْفُـهُ، فَـالنِّصْفُ فَـرْضُ بَعْـلِ

---

بەم كیژە برایە بێ بەش، دەبێ لە میرات؟ چونكە برای تەنها لە باوكی بەهۆی برای لە باوكیو دایكی بێ بەش دەبێ، هەروەها ئەگەر لە پاشی بەجێما: پورێك كە تەنها لە دایكەوە خوشكی باوكی بوو لەگەڵ كیژە برایەكی لە دایكیو باوكی، ئەوە میراتەكە گشتی بۆ پورەكەیەو، كیژە برایەكەش بێ بەش دەبێ، چونكە گشت برایەك بە هۆی باوك بێ بەش دەبێ لە میرات، هەروەك لە (تحفە)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَإِنْ يَذَرْ أَوْلَادَ فَرْعِ أُمٍّ) ئەگەر مردووەكە كوڕو كیژی خوشكی تەنها لە دایكی، یان كوڕو كیژی برای تەنها لە دایكیی لە پاش خۆی بەجێ بهێڵێ، ئەو كاتە (فَأَنْتَ سَوِّ بَيْنَهُمْ فِـي القَسْمِ) تۆ بە یەكسانی لە نێوان نێرو مێیەكاندا میراتەكە بەش بكە (أَوْ خَالَـةً وَالْخَـالَ مِنْهَا) یان ئەگەر خاڵی تەنها لە دایكیو خوشكە دایكی تەنها لە دایكیی لە دوای خۆی بەجێ هێشت، ئەو كاتە (لَزِمَا تَسْوِيَةً فِي قِسْمَةٍ بَيْنَهُمَا) واجبە: بە یەكسانی میراتەكەیان لە نێواندا بەش بكرێ، **ئینجا بزانە:** ئەمە ئەرموودەی (تحفة)و (نهایة)و (مغنی) بوو، بەڵام لە چەند كتێبێكی تردا زانایان فەرسوویانە: ئەم خاڵو پوورەی تەنها لە دایكی، میراتەكە بە ڕووی پشتێ بەش دەكەن، واتە: خاڵەكە دوو هەندی پوورەكەی دەدرێتێ، هەروەك لە حاشیەكانی (إبن قاسم)و (الشروانی) ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿هَذا بَيَانُ الفُرُوضِ الْمُقَدَّرَةِ فِى القُرْآنِ مَعَ بَيَانِ أَهْلِيهَا: ئەمە ڕوونكردنەوەی بەشە میراتەكانو خاوەنەكانیانە: كە لە قورئاندا دیار كراون﴾

(ثُمَّ الفُرُوضُ) ئینجا ئەو بەشە میراتانەی لە قورئانی پیرۆز لە سورەتی (النساء)دا دیار كراون بۆ میراتگرەكان (سِتَّةٌ) شەش بەشن (وَأَخْصَـرُ عِبـارَةٍ عَنْـهَا بِـهَا يُعَـبَّرُ) كورتترین ڕستە: كە واتەی ئەو بەشانەی پێ ڕوون بكرێتەوە، ئەمەیە: (اَلرُّبْـعُ) چوارێك $=\frac{1}{4}$ و (وَالثُّلْـثُ) سێیەك $=\frac{1}{3}$ (وَضِعْـفُ كُـلِّ) دوو چەندانەی هەر یەكێك لەو دووانەش، واتە: (النِّصف) نیوە $=\frac{1}{2}$ و (الثلثان) دوو سێیەك $=\frac{2}{3}$ هەم (وَنِصْفُـهُ) نیوەی هەر یەكێك لە هەردووكیشیان، واتە: (الثّمن) هەشتێك $=\frac{1}{8}$ و (السّدس) شەشێك $=\frac{1}{6}$.

لاَ فَـــرْعَ لاِمْرَأَتِـــهِ، وَالأُخْـــتِ ٦٩ لأَبَوَيْـــنِ أَوْ أَبٍ، وَالبِنْـــتِ

وَبِنْـتِ الإِبْـنِ حَيْـثُ كُـلٌّ تَنْفَـرِدْ ٧٠ وَالرُّبْـعُ لِلـزَّوْجِ إِذِ الفَـرْعُ وُجِـدْ

لِعِرْسِـــهِ، وَزَوْجَـــةٍ فَـــأَكْثَرَا ٧١ إِنْ لَـمْ يَكُـنْ فَـرْعٌ لِـزَوْجٍ قُـبِرَا

---

١- ( **فَالنِّصْفُ** ) نیوەیی بەشی پێنج میراتگرانە، **یەکـەم:** (فَرْضُ بَعْلٍ) بەشی مێردی ژنەکەیە، بەو مەرجەی (لاَ فَرْعَ لاِمْرَأَتِه) ژنە مردووەکەی: نە کوڕو کیژی خۆیو، نە کوڕو کیژی کوڕیو، نە بەرەو خوارتریشی نەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَكُـمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ﴾ ئێوە نیوەی ئەو میراتەتان هەیە: کە ژنەکانتان بەجێیان هێشتوە، بەو مەرجەی ژنەکان کوڕو کیژیان نەبن. **دووەم:** (وَالأُخْتِ لأَبَوَيْنِ) بەشی خوشکێکی لە دایکیو باوکییە. **سێیەم:** (أَوْ لأَبٍ) بەشی خوشکێکی تەنها لە باوکییە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَـرَكَ﴾ ئەگەر مردووەکە خوشکێکی هەبوو، ئەوە نیوەی میراتەکەی هەیە. **چوارەم:** (وَالبِنْـتِ) بەشی کیژێکی مردووەکەیە. **پێنجـەم:** (وَبِنْـتِ الإِبْـنِ) بەشی کیژێکی کوڕی مردووەکەیە، هەرچەند بەرەو خوارتریش بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَـهَا النِّصْفُ﴾ ئەگەر میراتگرەکە یەك کیژ بوو، ئەوە نیوەیی هەیە. (حَيْثُ كُـلٌّ تَنْفَـرِدْ) بەو مەرجەی ئەو چوار ئافرەتانەی ڕابردوو گشتیان بە تەنها بن، واتە: هیچ میراتگرێکی وەهایان لەگەڵدا نەبێ: کە بیانکاتە میراتگری پشتێ، یان بەشیان کەم بکاتەوە، یان بێ بەشیان بکا، هەم میراتگرێکی وەکو خۆیشیان لەگەڵدا نەبێ.

٢- ( **وَالرُّبْعُ** ) چوارێك بەشی دوو میراتگرانە، **یەکەم:** (لِلزَّوْجِ) بەشی مێردی ژنەکەیە (إِذِ الفَرْعُ وُجِدَ لِعِرْسِهِ) لەو حاڵەتەی ژنە مردووەکەی: کوڕ، یان کیژی خۆی هەبێ، یان کوڕی، یان کیژی کوڕی هەبێ، هەرچەند بەرەو خوارتریش بن، جیاوازی نیە: کوڕو کیژەکەی لەم مێردە بووبن، یان لە مێردێکی تر، یان لە زینا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ﴾ ئەگەر ژنەکانتان منداڵیان هەبوو، ئێوە چوارێکی میراتتان هەیە. **دووەم:** (وَزَوْجَةٍ فَأَكْثَرَا) بەشی ژنێکی مردووەکەو زیاتر لە ژنێکیەتی تا دەگاتە چوار ژن، واتە: چوارێکەکە لە نێوان خۆیاندا بەش دەکەن (إِنْ لَمْ يَكُنْ فَرْعٌ لِزَوْجٍ قُبِرَا) بەو مەرجەی مێردە مردووەکەی: نە کوڕو کیژی خۆیو، نە کوڕو کیژی کوڕیو، نەبەرەو خوارتریشی نەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِنْ لَـمْ يَكُنْ لَكُمْ وَلَدٌ﴾ ژنەکانتان چوارێکیان هەیە، ئەگەر ئێوە منداڵتان نەبێ.

وَالثُّمْنَ تَسْتَحِقُّهُ مَعْ فَرْعٍ ٧٢ وَالإرْثُ جارٍ فِي الطَّلاَقِ الرَّجْعِي
وَالثُّلُثَانِ لإنَاثٍ تَرِثُ ٧٣ نِصْفاً إذَا تَعَدَّدَتْ، وَالثُّلْثُ

---

٣- (**وَالثُّمْنَ**) هەشتێك بەشی یەك میراتگرە، چونكە (تَسْتَحِقُّهُ) ژنی مردووەكە مافی هەشتێكی هەیە، واتە: لە ژنێكەوە تا دەگاتە چوار ژن، هەشتێكەكە لە نێوان خۆیاندا بەش دەكەن، لەو حاڵەتەی (مَعَ فَرْعٍ) كوڕ، یان كیژی مێردەكەی لەگەڵدا بێ، یان كوڕی، یان كیژی كوڕی مێردەكەی، یان بەرەو خوارتری لەگەڵدا بێ، جیاوازی نیە: كوڕو كیژەكەی لەم ژنە بووبن، یان لە ژنێكی تر، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُمْ﴾ ئەگەر ئێوە منداڵتان هەبوو، ئەوە ژنەكانتان هەشتێكیان هەیە لە میراتەكەتان.

**ئینجا بزانە:** لە گشت ئەو حاڵەتانەی ڕابردوودا مەرجە كوڕو كیژی خۆی و، كوڕو كیژی كوڕ: میراتگر بن، واتە: ئەگەر ئەوانە بە هۆی كوشتن، یان كافر بوون، یان كۆیلەیی میرات نەگرن ئەوكاتە هەبوونیان وەك نەبوونە، واتە: كار لە میراتی ژن و مێردەكە ناكا، بەڵكو مێردەكە نیوەیی هەر دەدرێتێ و، ژنەكەش چوارێكی هەر دەدرێتێ، هەروەك لە (تحفة) و (نهایة) و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە. ئینجا ئاگادر بە: (وَالإرْثُ جارٍ فِي الطَّلاَقِ الرَّجْعِي) میرات لە یەكتری گرتن لە نێوان ژن و مێرددا لە (عدة)ی تەلاقی (الرَّجْعِي)شدا هەر بەردەوامە، تا (عدة)كە تەواو دەبێ.

٤- (**وَالثُّلُثَانِ**) دوو سێیەك بەشی چوار میراتگرانە، چونكە (لإنَاثٍ تَرِثُ نِصْفاً) بەشی ئەو چوار ئافرەتانەیە: كە بە تەنهایی نیوەیان دەگرت: كە كیژ و، كیژی كوڕ و، خوشكی لە دایكی و باوكی و، خوشكی تەنها لە باوكی بوو، ئینجا بەو مەرجە دوو سێیەك دەگرن: (إِذَا تَعَدَّدَتْ) هەر كاتێك ژمارەیان لە یەك زیاتر بێ، واتە: دوو كیژ و زۆرتر لە دوو كیژی مردووەكە، یان دوو كیژی كوڕ و زۆرتر لە دوو كیژە كوڕی مردووەكە بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، جیاوازی نیە كیژە كوڕەكان هی یەك باوك بن، یان هی زۆر باوكان بن، واتە: دوو سێیەكەكە لە نێوان خۆیاندا بەش دەكەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾ ئەگەر كیژەكان دووو بەسەرەوەتر بوون، ئەوە دوو سێیەكی میراتەكەیان هەیە. هەم وەكو دوو خوشك و زۆرتر لە دوو خوشك: جا لە دایكی و باوكی بن، یان تەنها لە باوكی بن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ ئەگەر خوشكەكان دوو بوون، ئەوە دوو سێیەكی میراتیان هەیە.

لأُمِّ مَيْـتٍ لَـمْ يَكُـنْ لَـهُ عَـدَدْ ٧٤ مِمَّـنْ لَـهُ أُخُـوَّةٌ وَلاَ وَلَـدْ
وَعَـدَدٍ مِـنْ وَلَـدِ الأُمِّ، وَقَـدْ ٧٥ يُفْـرَضُ ثُلْـثٌ مَـعَ إِخْـوَةٍ لِجَـدّْ
وَالسُّدْسُ فَرْضُ وَالِـدٍ وَفَـرْضُ جَـدّْ ٧٦ لَـمْ يُـدْلِ بِـالأُنْثَى إِذَا كَـانَ وَلَـدْ

---

**ئینجا بزانه:** لەو چوارانەشدا مەرجە: **هیچ** میراتگرێکی وەها یان لەگەڵدا نەبێ: کە بیانکاتە میراتگری پشتێ، یان بەشیان کەم بکاتەوە، یان بێ بەشیان بکا لە میرات، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە.

٥- (**وَالثُّلْثُ**) سێیەك بەشی دوو میراتگرانە، **یەکەم:** (لأُمِّ مَيْـتٍ) بەشی دایکی مردووەکەیە، بەو مەرجەی (لَمْ يَكُنْ لَهُ عَدَدٌ مِمَّنْ لَهُ أُخُوَّةٌ) مردووەکە: دوو، یان زیاتر لە دووان خوشكو برای نەبن، جیاوازی نیە: لە دایکیو باوك بن، یان تەنها لە باوکی، یان تەنها لە دایکی، **هەم** بەو مەرجەش (وَلاَ وَلَدٌ) مردووەکە **هیچ** کوڕو **هیچ** کیژێکی خۆیو، **هیچ** کوڕی کوڕو **هیچ** کیژێکی کوڕو بەرەو خوارتریشی نەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ﴾ ئەگەر مردووەکە کوڕو کیژی نەبوونو دایكو باوکیشی میراتیان لێ دەگرت ئەوە دایکەکەی سێیەکی هەیە.

**دووەم:** (وَعَدَدٍ مِنْ وَلَدِ الأُمِّ) بەشی دووانو زیاتر لە دووانە لەو خوشكو برایانەی تەنها لە دایکەوە خوشكو برای مردووەکەن، جیاوازی نێرو مێ نیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾ ئەگەر خوشكو برایەکانی تەنها لە دایکی لە یەك کەس زۆرتر بوون، ئەوە گشتیان لە سێیەکی میراتەکەدا هاوبەشن. (وَقَدْ يُفْرَضُ ثُلْثٌ مَعَ إِخْوَةٍ لِجَدّ) هەندێ جاریش سێیەك بۆ باپیرە دادەندرێ لەو حاڵەتەی لەگەڵ برایەکانی مردووەکەدا بێ، هەروەك لە باسی (میراتی باپیرە)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ الله تعالى.

٦- (**وَالسُّدْسُ**) شەشێك بەشی حەفت کەسانە، **یەکەم:** (فَرْضُ وَالِدٍ) بەشی باوکی مردووەکەیە. **دووەم:** (وَفَرْضُ جَدّ) بەشی باپیرەی مردووەکەیە ئەگەر باوك نەبێو، هەم بەو مەرجەش (لَمْ يُدْلِ بِالأُنْثَى) باپیرەکە بەمێیینە نەگاتە مردووەکە، واتە: باوکی باوكو بە سەرەوەتر بێ، نەك باوکی دایك، ئینجا لەو حاڵەتەدا باوكو باپیرە شەشێکیان هەیە: (إِذَا كَانَ وَلَدْ) ئەگەر مردووەکە: کوڕ، یان کیژی خۆی هەبێ، یان کوڕی کوڕ، یان کیژی کوڕ، یان بەرەو خوارتری هەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ﴾ دایكو باوکی مردووەکە هەر یەکەیان شەشێکی میراتەکەیان هەیە، ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبێ، واتە: لەم ئایەتەدا باپیرە وەکو باوکە.

وَجَـــدَّةَ فَصــاعِدَاً دُونَ الَّتِـــى ٧٧ بــالجَدِّ بَيْـــنَ أُنْثَيَيْـــنِ أَدْلَـــتِ
وَفَـرْضُ أُمِّ مَيِّـــتٍ لَـــهُ عَـــدَدْ ٧٨ مِـنْ إِخْـوَةٍ وَأَخَـــواتٍ أَوْ وَلَـــدْ

---

**سێیەم:** (وَجَدَّةٍ فَصاعِداً) شەشێك بەشی داپیرەیەكو زیاتر لە داپیرەیەكە، بەو مەرجەی دایكی مردووەكە نەمابێ، جیاوازی نیە مردووەكە: براو منداڵی هەبن، یان نەیبن، هەروەك لە (شرح الرحبیة)دا فەرموویەتی، هەروەها جیاوازی نیە داپیرەكە: دایكی دایكو بەسەرەوەتر بێ، یان دایكی باوكو بەسەرەوەتر بێ ﴿عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيّ ﷺ جَعَلَ لِلْجَدَّةِ السُّدُس إِذَا لَمْ تَكُنْ دُونَها أُمٌّ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، پێغەمبەر ﷺ شەشێكی بۆ داپیرە داناوە، بەو مەرجەی لەخۆی بەرەو خوارتر دایكێك نەبێ. جا ئەگەر لە داپیرەیەك زیاتر بوون: وەك دایكی دایكی باوكو، دایكی باپیرەو، دایكی دایك، ئەوە كاتە شەشێكەكە لە نێوان خۆیاندا بەش دەكەن، هەروەك (أصحاب السنن بسند صحیح) گێڕاویەتیانەوەو، هەم (مغنی)ش فەرموویەتی (دُونَ الَّتِی) بەڵام ئەو داپیرەیە میرات ناگرێ: كە (بِالجَدِّ بَیْنَ أُنْثَیَیْنِ أَدْلَت) بە باپیرەیەكی نێوان دوو مێیینە گەیوەتە مردووەكە: وەك دایكی باوكی دایك؟ چونكە ئەمەیان لە (ذَوِی الأَرْحَام)ەكانە، ئینجا بزانە: لە لایەنی دایكەوە تەنها یەك داپیرە میرات دەگرێ بەبەردەوامی، هەروەك لە (تحفە)و (مغنی)دا فەرموویانە.

**چوارەم:** (وَفَرْضُ أُمِّ مَیِّتٍ) شەشێك بەشی دایكی ئەو مردووەیە: كە (لَهُ عَدَدٌ مِنْ إِخْوَةٍ وَأَخَواتٍ) دوو، یان زیاتر خوشكو برای هەبن، جیاوازی نیە گشتیان: برابن، یان خوشك بن، یان خوشكو برا بن، جا لە دایكو باوكی بن، یان تەنها لە دایكی، یان تەنها لە باوكی، هەروەها جیاوازی نیە لەو خوشكو برایانە: یەكێكیان، یان گشتیان بە هۆی كەسێكی تر بێ بەش ببن لە میرات، یان نا (أَوْ وَلَدٌ) یان مردووەكە: كوڕ، یان كیژی خۆی هەبێ، یان كوڕی كوڕ، یان كیژی كوڕ، یان بەرەو خوارتری هەبێ، بە بەڵگەی ئایەتەكەی ڕابردوو، هەم خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ ئەگەر مردووەكە برای هەبن، دایكەكەی شەشێكی هەیە. **ئینجا بزانە:** لێرەشدا لە گشت ئەوانەی ڕابردوودا مەرجە: كوڕو كیژەكەیو كوڕو كیژی كوڕەكەیو، خوشكو برایەكانیش میراتگر بن، واتە: ئەگەر ئەوانە بە هۆی كۆیلەیی، یان كوشتن، یان كافر بوون میرات نەگرن، ئەو كاتە هەبوونیان وەك نەبوونە، واتە: كار لە میراتی باوكو باپیرەو دایك ناكا، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا ڕوون كراوەتەوە.

وَفَــرْضُ بِنْــتٍ هَــيَ لإِبْــنٍ يُقْــبَرُ ٧٩ وَتَسْــتَوي وَاحِــدَةٌ وَأَكْــثَرُ
إِنْ تَصْحَبِ البِنْــتَ الَّتِــى لِلصُّلْــبِ ٨٠ أَوْ ابْنَــةَ ابْــنٍ فَوْقَــهَا فِــي القُــرْبِ
وَأُخْــتٍ أَوْ أَكْــثَرَ فَــرْعٍ وَالِــدِ ٨١ مَــعَ شَــقِيقَةٍ، وَفَــرْضُ وَاحِــدِ
مِــنْ وَلَــدِ الأُمِّ سَــوَاءٌ الذَّكَــرْ ٨٢ مِنْــهُمْ وَغَــيْرُهُ، وَبَعْــضُ مَــنْ غَــبَرْ
كَمَــا يَكُــونُ آخِــذَ النَّصِيــبِ ٨٣ بِــالفَرْضِ قَــدْ يَــأْخُذُ بِــالتَّعْصِيبِ

---

**پێنجەم:** (وَفَرْضُ بِنْتٍ هَيَ لإِبْنٍ يُقْبَرُ) شەشـێك بەشـی كیـژی كوڕی مردووەكەیـە، بـەو مەرجەی كوڕی مردووەكە مردبێ (وَتَسْتَوي وَاحِـدَةٌ وَأَكْثَرُ) یـەك كیـژە كـوڕو زۆرتریـش یەكسانن‌و، شەشێكەكە لە نێوان خۆیاندا بەش دەكەن، جیاوازی نیە: گشتیان لـە یـەك باوك بن، یان لە زۆر باوكان بن، هەرچەند بەرەو خوارتریش بن، ئینجا كیـژە كـوڕ لـەو حاڵەتەدا شەشێكی هەیە (إِنْ تَصْحَبِ البِنْتَ الَّتِى لِلصُّلْـبِ) ئەگـەر لەگـەڵ كیـژی خـودی مردووەكەدا بێ (أَوْ ابْنَةَ ابْنٍ فَوْقَهَا فِي القُرْبِ) یان لەگەڵ كیـژە كوڕێكـی تـری لـە خـۆی نزیكتر دابێ ﴿عَنْ إِبْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ للإِبْنَةِ النِّصْفَ، وَللإِبْنَةِ الإِبْـنِ السُّدُسَ تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ وَمَا بَقِيَ للأُخْـــتِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا: نیوەی میرات بۆ كیژی مردووەكە بێ‌و، شەشـێكی بـۆ كیـژی كوڕەكـەی بـێ، تـا ببێتـە تەواو كەری دوو سێیەك، پاشماوەكەشی بۆ خوشكەكەی بێ.

**شەشەم:** (وَأُخْتٍ أَوْ أَكْثَرَ فَرْعٍ وَالِدِ) شەشێك بەشی خوشكێك‌و زیاتر لـە خوشـكێكە: كـە تەنها لە باوكەوە خوشكی مردووەكە بـن، واتـە: شەشـێكەكە لـە نێـوان خۆیـاندا بـەش دەكەن، لەو حاڵەتەی (مَعَ شَقِيقَةٍ) لەگەڵ خوشكی لە دایكی‌و باوكی دابن، بـە (قیـاس) لەسەر كیژو كیژی كوڕ. **حەوتەم:** (وَفَرْضُ وَاحِدِ مِنْ وَلَدِ الأُمِّ) شـەشێك بەشـی تـەنها یەكێكە لەو خوشك‌و برایانەی تەنها لە دایكەوە خوشك‌و برای مردووەكەن (سَوَاءٌ الذَّكَرُ مِنْهُمْ وَغَيْرُهُ) نـێرو مێیـەكانیان یەكسانن‌و جیاوازییـان نیـە لـە شەشـێك گرتـن، خـوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ﴾ ئەگـەر مردووەكـە برایەكی لە دایكی، یان خوشكێكی لە دایكی هەبوو، ئەوە هەر یـەكێك لـەوان شەشـێكی هەیە. (وَبَعْضُ مَنْ غَبَرَ) هـەندێك لـەو میراتگرانـەی ڕابـران (كَمَا يَكُونُ آخِذَ النَّصِيبِ بِالفَرْضِ) هەروەك بە خاوە بەشی میرات دەگرێ (قَدْ يَأْخُذُ بِالتَّعْصِيبِ) هەندێك جاریش بە ڕووی پشتێوە میرات دەگرێ: وەكو باوك‌و باپیرەو، خوشك‌و، كیژو كیژە كوڕ....

## هٰذا بَيَانُ حَجْبِ الْحِرْمان

لاَ يُحْجَبُ الأَبُ وَأُمٌّ وَوَلَدْ ٨٤ وَزَوْجَةٌ أَيْضاً وَزَوْجٌ بِأَحَدْ
بَلْ يُحْجَبُ ابْنُ الإِبْنِ بِابْنِ الصُّلْبِ ٨٥ أَوْ إِبْنِ الابْنِ فَوْقَهُ فِي القُرْبْ
وَالْجَدُّ لاَ يَحْجُبُهُ إِلاَّ ذَكَرْ ٨٦ وَقَعَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ مَنْ عَبَرْ

---

﴿**ئاگاداری**﴾ ئەگەر دوو کەس لە زگماکدا پێکەوە نووسابوون، ئەوە بە دوو میراتگر دادەندرێن، بەو مەرجەی دوو سەریان هەبن، هەروەك لە (تحفە)و (مغنی)دا فەرموویانە، واتە: -جگە لەسەر- مەرج نیە: ئەندامەکانی تر بە ژمارەی دوو کەسان بن، بەڵکو هەر کاتێك بزانین: ژیانی هەر سەرێکیان لەوی تر جیایەو سەربەخۆیە، ئەوە بە دوو کەس دادەندرێن، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.

### ﴿هٰذا بَيَانُ حَجْبِ الْحِرْمانِ: ئەمە ڕوونکردنەوەی بێ بەش کردنە لە میرات﴾

بزانە: (الْحَجب) قەدەغە کردن دوو بەشە:

**یەکەم:** (حَجْبُ النُّقْصَانِ) قەدەغە کردنی ناتەواوی: وەك میراتگرەکە بەهۆی میراتگرێکی تر بەشی کەم ببێتەوە: هەروەك دایك -بەهۆی کوڕ- لە سێیەکەوە دێتەوە سەر شەشێك، یان ژن -بەهۆی کوڕ- لە چوارێکەوە دێتە سەر هەشتێك...هتد، جا ئەمەیان لە باسەکەی ڕابردوودا بە درێژی ڕوون کراوەتەوە، والْحَمْدُ لله تَعالَى.

**دووەم:** (حَجْبُ الحِرْمانِ) قەدەغە کردنی بێ بەشی: وەك میراتگرەکە بەهۆی میراتگرێکی لەخۆی بەهێزتر بێ بەش ببێ لە گشت میراتەکە -هەروەك لێرەدا ڕوونی دەکەینەوە- یان بەهۆی سیفەتێك لە گشت میراتەکە بێ بەش ببێ، هەروەك لە باسی (هۆیەکانی میرات نەگرتن)دا ڕوونی دەکەینەوە، إِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

(لاَ يُحْجَبُ الأَبُ وَأُمٌّ وَوَلَدْ) باوكو دایكو کوڕو کیژ بەهیچ کەسێك بێ بەش نابن لە میرات، هەروەها (وَزَوْجَةٌ أَيْضاً وَزَوْجٌ بِأَحَدْ) ژنو مێردیش بەهیچ کەسێك بێ بەش نابن لە میرات، گشتیان بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، بەڵام وادەبێ: میراتگرێکی تر بەشیان کەم دەکاتەوە، هەروەك لە باسەکەی ڕابردوودا ڕوون کراوە (بَلْ يُحْجَبُ ابْنُ الإِبْنِ بِإبْنِ الصُّلْبِ) بەڵکو بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام: کوڕی کوڕ بە کوڕی مردووەکە بێ بەش دەبێو (أَوْ إِبْنِ الابْنِ فَوْقَهُ فِي القُرْبْ) یان بە کورە کوڕێکی لە خۆی نزیکتر لە مردووەکە، بۆ وێنە: کوڕی کوڕی کوڕ، بە کوڕی کوڕ بێ بەش دەبێ...هتد.

(وَ) هەر بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام (الْجَدُّ) باپیرە، واتە: باوکی باوكو بەسەرەوەتر (لاَ يَحْجُبُهُ إِلاَّ ذَكَرْ) هیچ کەسێك بێ بەشی ناکا تەنها ئەو نێرینەیە نەبێ: کە (وَقَعَ بَيْنَهُ

إِذْ كُــلُّ مَـــنْ إِدْلاَؤُهُ بِـــالْغَيْرِ ٨٧ صَـارَ بِـهِ مُحْتَجَبـاً عَـنْ خَـيْرِ
وَخُصَّ مِـنْ عُمُـومِ هَـذَا الضَّـابِطِ ٨٨ وَلَـدُ أُمٍّ فَـهُوَ غَـيْرُ سَـاقِطِ
وَالأَخُ مِـنْ أَبٍ وَأُمٍّ احْتَجَـبْ ٨٩ بِالإِبْنِ وَإِبْـنِ الإِبْـنِ أَيْضـاً وَبِـأَبْ
وَالأَخُ مِـنْ أَبٍ بِـهَؤُلاَ حُجِـبْ ٩٠ وَبِـأَخٍ لأَبَوَيْـنِ يَنْتَسِـبْ
وَالأَخُ مِـنْ أُمٍّ عَـنِ الإِرْثِ يُصَـدّْ ٩١ بِوَلَـدٍ أَوْ وَالِـدٍ أَيْضـاً وَجَـدّْ
وَإِبْـنُ الشَّـقِيقِ بِشَـقِيقٍ احْتَجَـبْ ٩٢ وَابْـنٍ وَابْنِـهِ وَبِـالْجَدِّ وَأَبْ

---

وَبَيْنَ مَنْ عَبَرْ) کەوتۆتە نێوان باپیرەکەو ئەو کەسەی مردوە، بۆ وێنە: بـاوکی بـاوك بـە باوك بێ بەش دەبێ...هتد، (إِذْ) چونکە (قاعدة)یە: (كُلُّ مَنْ إِدْلاَؤُهُ بِالْغَيْرِ) هەر کەسێك بە هۆی کەسێکیتر بگاتـە مردووەکـە (صَارَ بِـهِ مُحْتَجَباً عَنْ خَيْرِ) بـەو کەسـەش لـە وەرگرتنی میرات بێ بەش دەبێ، بەڵام (وَخُصَّ مِنْ عُمُومِ هَذَا الضَّابِطِ وَلَدُ أُمّ) خوشكو برای تەنها لە دایکی لەو (قاعدة)یە جیا کراونەتەوە (فَهُوَ غَيْرُ سَاقِطِ) ئەو خوشکەو ئەو برایە هیچێکیان بە هۆی دایك بێ بەش نابێ.

(وَ)هەر بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام (الأَخُ مِنْ أَبٍ وَأُمّ احْتَجَبْ) برای لە دایکیو بـاوکی بەسێ کەسان بێ بەش دەبێ: (بِالإِبْنِ وَإِبْنِ الإِبْنِ أَيْضاً وَبِأَبْ) بە کـوڕو بـە کـوڕی کـوڕو بەرەو خوارترو بە باوك. (وَ) هەروەها (الأَخُ مِنْ أَبٍ بِهَؤُلاَ حُجِبْ) بـرای تـەنها لـە بـاوکی بەو سێیانەی ڕابردوو بـێ بـەش دەبـێو، هـەم (وَبِأَخٍ لأَبَوَيْـنِ يَنْتَسِـبْ) بـە برایـەکی لـە دایکیو باوکیش بـێ بـەش دەبـێ، چونکـە ئەمـەیان خزمایـەتیی بـەهێزترە، هـەروەها خوشکێکی لـە دایکـیو بـاوکیش –ئەگـەر لەگـەڵ کیـژی مردووەکـە، یـان کیـژە کـوڕی مردووەکەدا بێ– ئەویش برای تەنـها لـە بـاوکی بێ بـەش دەکـا، هـەروەك لـە میراتـی (خوشكو برا)دا ڕوونی دەکەینەوە، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى، (وَالأَخُ مِنْ أُمّ) بـرای تەنـها لـە دایکی (عَنِ الإِرْثِ يُصَدّ) لە میراتەکە بێ بەش دەکرێ بەم چوار کەسانە: (بِوَلَدٍ) بە کوڕ، یان کیژی مردووەکەو، هەم بە کوڕی، یان کیژی کـوڕی مردووەکـەو بـەرەو خوارتریش (أَوْ وَالِدٍ أَيْضاً) هەم بە باوكو (وَجَدّ) بە باپیرە، بە بەڵگەی ئایەتی ﴿يُورَثُ كَلاَلَـةً﴾ واتە: مردووەکە باوكو باپیرەو کوڕو کوڕی کوڕی نەبێ.

(وَإِبْنُ الشَّقِيقِ) کوڕە برای لە دایکیو باوکی بەم شەش کەسانە بێ بەش دەبێ: (بِشَقِيقٍ احْتَجَبْ) بە برای لە دایکیو باوکی بێ بـەش دەبـێ، چونکـە بـە هـۆی نزیکـتری لـەوی

وَبِـأَخٍ لِـلأَبِ فَـهُوَ أَقْـرَبُ ٩٣ وَابْـنُ أَخٍ لِوالِـدٍ يُحْتَجَـبُ
بِـهَؤُلاَ وَابْـنِ الشَّـقِيقِ، وَاحْظُـلاَ ٩٤ عَمًّـاً لأُمٍّ وَأَبٍ بِـهَؤُلاَ
وَابْـنِ أَخٍ مُنْفَسِـخٍ عَـنْ أُمٍّ ٩٥ وَلأَبٍ بِـهَؤُلاَ وَعَـمٍّ
لأَبَوَيْـنِ، وَاحْجُـبِ ابْـنَ عَـمٍّ ٩٦ مُنْتَسِـبِ لِوالِـدٍ وَأُمِّ
بِـهَؤُلاَءِ وَبِعَـمٍّ لأَبِ ٩٧ أَمَّـا إِبْنُ عَـمٍّ لأَبٍ فَلْيُحْجَـبِ
بِـهَؤُلاَءِ الرَّهْـطِ وَابْـنِ عَـمٍّ ٩٨ مُنْتَسِـبٍ لَوالِـدٍ وَأُمِّ

---

بەهێزترە (وَابْنِ وَابْنِهِ) هەم بە کوڕو بە کوڕی کوڕو بەرەو خوارتـرو (وَبِـالْجَدِّ وَأَبْ) هـەم بە باوکو بە باپیرەو بەسەرەوە تریش بێ بەش دەبێ، چونکە ئەو چوارانـە –بـە هـۆی لایـەنی بابایـەتیو کوڕایـەتی– لـەوی بـەهێزترنو، هـەم (وَبِـأَخٍ لِـلأَبِ) بـە بـرای تەنـها لەباوکیش بێ بەش دەبـێ، چونکـە (فَـهُوَ أَقْـرَبُ) ئـەوە لـەوی نزیکـترەو بـەهێزترە (وَ) هەروەها (ابْنُ أَخٍ لِوالِدٍ يُحْتَجَبُ) کوڕە برای تەنها لە باوکی بێ بەش دەبێ: (بِـهَؤُلاَ) بـەو شەش کەسانەی ڕابردوو، هەم (وَابْنِ الشَّقِيقِ) بـە کـوڕە بـرای لـە دایکـیو بـاوکیش بـێ بەش دەبێ، چونکە ئەمەیان خزمایەتیی بەهێزترە.
(وَاحْظُلاَ عَمًّاً لأُمٍّ وَأَبٍ) مامی لە دایکیو بـاوکی بـێ بـەش بکـە لـە مـیرات (بِـهَؤُلاَءِ) بـەو حـەفت کەسـانەی ڕابـردوو، هـەم (وَابْـنِ أَخٍ مُنْفَسِـخٍ عَـنْ أُمٍّ) بـە کـوڕە بـرای تەنـها لـە باوکیش، چونکە لایەنی کوڕە برایەتی لە لایەنی مامایەتی بەهێزترە (وَ) هەروەها (لأَبٍ) مامی تەنها لە باوکی بێ بەش بکە (بِهَؤُلاَءِ) بەو هەشت کەسـانەی ڕابـردوو، هـەم (وَعَـمٍّ لأَبَوَيْنِ) بە مامی لە دایکیو باوکیش چونکـە ئەمـەیان خزمایـەتیی بـەهێزترە (وَاحْجُبِ ابْنَ عَمٍّ مُنْتَسِبٍ لِوالِدٍ وَأُمٍّ) کوڕە مامی لە دایکیو باوکی بێ بەش بکە، (بِهَؤُلاَءِ) بـەو نـۆ کەسانەی ڕابردوو، هەم (وَبِعَمٍّ لأَبِ) بە مامی تەنها لە باوکیش، چونکـە مـام لـە مـامۆزا نزیکترە (أَمَّا إِبْنُ عَمٍّ لأَبٍ) کـوڕە مـامی تەنـها لـە بـاوکی (فَلْيُحْجَـبِ) بـا بـێ بـەش ببـێ (بِهَؤُلاَءِ الرَّهْطِ) بەو دە کەسانەی ڕابردوو، هەم (وَابْنِ عَـمٍّ مُنْتَسِبٍ لَوالِدٍ وَأُمٍّ) بـە کـوڕە مامی لە دایکیو باوکیش چونکە خزمایەتیی بەهێزترە.
هەروەها مامی باوکی مردووەکەش بەو یازدە کەسانەی ڕابردوو بێ بەش دەبـێو، هـەم بە کوڕە مامی تەنها لە باوکیش، هەروەها کوڕە مامی باوکی مردووەکـەش بـەو دوانـزە کەسانەی ڕابردوو بێ بەش دەبێو، هەم بە مامی باوکی مردووەکـەش، هـەروەها مـامی

وَبِنْتُ الإِبْنِ بِـــابْنِ صُلْـبٍ تُحْجَـبُ ٩٩ وَبِـــابْنَتَيْنِ حَيْـــثُ لاَ تُعَصَّـــبُ
وَجَــدَّةٌ لِـــلأُمِّ بِـــالأُمِّ احْجُـــبِ ١٠٠ وَلأَبٍ بِـــأُمٍّ أَيْضـــاً وَأَبِ
وَاحْجُــبْ بِقُرْبَــى جِهَــةٍ بُعْداهَـــا ١٠١ إِنْ لَــمْ تَــرِثْ مِــنْ جِهَــةٍ سِــواهَا
وَحُجِبَـــتْ بُعْـــدَى أَبٍ بِقُرْبَـــى ١٠٢ وَالِـــدَةٍ، وَعَكْـــسُ ذَاكَ يُؤْبَـــى
وَحَجَبَـــتْ أَهْـلَ الـوَلاَءِ العَصَبَـــةْ ١٠٣ كَالأَخِ أُخْـــتٌ ضِدَّهَــا مَــنْ حَجَبَــهْ

---

باپیرەی مردووەکەش، بەو سێزدە کەسانەی ڕابردوو بێ بەش دەبێو، هەم بە کوڕە مامی باوکی مردووەکەش، هەروەها کوڕە مامی باپیرەی مردووەکەش بەو چواردە کەسانە بێ بەش دەبێو، هەم بە مامی باپیرەی مردووەکەش.
(وَبِنْتُ الإِبْنِ) کیژە کوڕی مردووەکە (بِابْنِ صُلْبٍ تُحْجَبُ) بە کوڕی مردووەکە بێبەش دەبێو، هەم (وَبِابْنَتَيْنِ حَيْثُ لاَ تُعَصَّبُ) بە دوو کیژی مردووەکەو زیاتریش بێ بەش دەبێ، بەو مەرجەی کیژە کوڕەکە نێرینەیەکی وەهای لەگەڵدا نەبێ: کە بیکاتە میراتگری پشتێ، واتە: ئەگەر کیژە کوڕەکە برای خۆی، یان کوڕە مامی خۆی لەگەڵدا بێ، ئەو کاتە بەهۆی دوو کیژەکە بێ بەش نابێ، بەڵکو لەگەڵ نێرینەکە پاشماوەکەی میراتەکە دەگرن. (وَجَدَّةٌ لِلأُمِّ) داپیرەی لای دایک، واتە: دایکی دایک (بِالأُمِّ احْجُبِ) تەنها بە دایك بێ بەشی بکە لە میرات، چونکە بە هۆی دایکەوە گەیشتۆتە مردووەکە، بەڵام (وَلأَبٍ) داپیرەی لای باوك، واتە: دایکی باوك (بِأُمٍّ أَيْضاً وَأَبِ) هەم بە دایكو، هەم بە باوك بێ بەشی بکە (وَاحْجُبْ بِقُرْبَى جِهَةٍ) بێ بەش بکە بە داپیرە نزیکترەکەی گشت لایەك (بُعْدَاهَا) داپیرە دوورترەکەی هەمان لا، بۆ وێنە: دایکی باوك دایکی دایکی باوكو هەم دایکی باوکی باوکیش بێ بەش دەکا، هەروەها دایکی دایك دایکی دایکی دایك بێ بەش دەکا (إِنْ لَمْ تَرِثْ مِنْ جِهَةٍ سِواهَا) بەو مەرجەی دوورترەکە -جگە لەلای نزیکترەکە- لەلایەکی ترەوە میرات نەگرێ (وَحُجِبَتْ بُعْدَى أَبٍ) داپیرە دوورترەکەی لای باوك، وەك دایکی دایکی باوك بێ بەش دەبێ (بِقُرْبَى وَالِدَةٍ) بە داپیرە نزیکترەکەی لای دایك: وەك دایکی دایك، بەڵام (وَعَكْسُ ذَاكَ يُؤْبَى) بە پێچەوانەی ڕابردوو نابێ، واتە: داپیرە دوورترەکەی لای دایك: وەك دایکی دایکی دایك، بە داپیرە نزیکترەکەی لای باوك بێ بەش نابێ: وەك دایکی باوك، بەڵکو هەردووکیان لە شەشێکی میراتەکەدا هاوبەشن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.
(وَحَجَبَتْ أَهْلَ الوَلاَءِ العَصَبَةُ) میراتگرە پشتێیەکانی نەژاد، ئازاد کەری کۆیلە مردووەکە بێ بەش دەکەن، جا ئازاد کەرەکە: نێر بێ، یان مێ بێ (كَالأَخِ أُخْتٌ) خوشك لە

وَأَخَـــوَاتٌ لأَبٍ مَـــا عُصِّبَـــتْ ١٠٤فَبِشَـــقِيقَتَيْنِ قَـــدْ تَحَجَّبَـــتْ
وَعُصْبَـــةٌ فُرُوضُـــهَا مُسْـــتَوْعِبَةٌ ١٠٥تَركَـــةٍ حَاجَبَـــةٌ لِلْعَصَبَـــةْ
كَمَـــنْ قَضَـــتْ عَـــنْ وَلَـــدٍ لأُمٍّ ١٠٦وَالــزَّوْجِ مَـــعْ وَالِـــدَةٍ وَعَـــمٍّ

---

هەرسێك لایەوە، وەكو برایە، واتە: (صَدَّهَا مَنْ حَجَبَهُ) ئەو كەسانەی برایەكان بێ بەش دەكەن خوشكەكانیش بێ بـەش دەكـەن، كەواتـە: خوشـكی لـە دایكـی بـاوكی بـەهۆی باوكو كوڕو كوڕی كوڕو بەرەو خوارتـر بـێ بـەش دەبـێ. هـەروەها خوشـكی تەنـها لـە باوكی بەو سێیانەو هەم بە برای لە دایكیو باوكی بێ بەش دەبێ. بەڵام خوشكی تەنها لە دایكی بە باوكو باپیرەو بە كوڕی، یان كیژی مردووەكەو بە كوڕی، یان كیژی كـوڕی مردووەكەو بەرەو خوارتریش بێ بەش دەبێ (وَأَخَوَاتٌ لأَبٍ مَا عُصِّبَتْ) ئەو خوشـكانەی تەنها لە باوكەوە خوشكی مردووەكەنو، برای خۆیان لەگەڵیاندا نیە بیانكاتە میراتگری پشتێ، ئەوانەش (فَبِشَقِيقَتَيْنِ قَدْ تَحَجَّبَتْ) بە دوو خوشكی لە دایكیو بـاوكی بـێ بـەش دەبن هەروەك بە برایەكی لە دایكی باوكیش بێ بەش دەبوون، بەڵام ئەگەر برای خۆیان لەگـەڵیاندا بـێ: ئـەو كاتـە برایەكـە دەیانكاتـە (عَصَبَـة) مـیراتگری پشـتێو، بـەو دوو خوشكانە بێ بەش نابن، بۆیێ بەو برایە دەگوترێ (الأَخُ الْمُبَـارَك) بـرای بـە بەرەكـەت، هەروەها خوشكێكی لە دایكیو باوكیش ئەگەر لەگەڵ كیژی مردووەكە، یان كیژە كوڕی مردووەكە دابێ: ئەویش خوشكی تەنها لە باوكی بێ بـەش دەكـا، هـەروەك لـە مـیراتی (خوشكو برا)دا ڕوونی دەكەینەوە، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى.

## ﴿بێ بەش بوونو، پێناسەی (عَصَبَة) میراتگری پشتێ﴾

(وَعُصْبَةٌ فُرُوضُهَا مُسْتَوْعِبَةُ تَرِكَةٍ) ئـەو خـاوەن بەشـانەی بەشـەكانیان گشـت میراتەكـە دادەگرێتەوە (حَاجِبَةٌ لِلْعَصَبَة) میراتگرەكانی پشتێ بێ بەشی دەكەن، واتە: هەر كاتێك میراتگرەكانی خاوەن بەش –بە گوێرەی بەشەكانی خۆیان– گشت میراتەكەیان گرت، ئەوە میراتگری پشتێ هیچـی بۆ نامێنێتـەوەو بـێ بـەش دەبـێ، چونكـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا فَمَا بَقِيَ فَلأَوْلَى رَجُـلٍ ذَكَـرٍ﴾ رواه البخـاري ومسلم، بەشە میراتەكان بدەنە خاوەنەكانیان، ئینجا ئەوەندەی دەمێنێتەوە، ئەوە بـۆ نزیكترین میراتگری نێرینەیە. واتە: ئەگەر هیچیش نەماوە، ئەو كاتە بێ بەش دەبێ، بۆ وێنە: (كَمَنْ قَضَتْ عَنْ وَلَدٍ لأُمٍّ) وەك ئەو ئافرەتـەی بمرێو برایـەكی تەنـها لـە دایكـیو (وَالزَّوْجِ) مێردو (مَعْ وَالِدَةٍ) دایكو (وَعَمٍّ) مـامی لـە پـاش بـەجێ بمێنـێ، ئـەوە خـاوەن

عَصَبَةُ الشَّخْصِ عَلَى مَا ذَكَرُوا ١٠٧ هُوَ الَّذِي لَيْسَ لَهُ مَقَدَّرُ
يَرِثُ مَا خَلَّفَهُ مَنْ يَقْضِي ١٠٨ أَوْ يَرِثُ البَاقِيَ بَعْدَ الفَرْضِ
الإِرْثُ شَرْطُ الْحَجْبِ فِي جَمِيعِ مَا ١٠٩ هُنَا وَفِي الفُرُوضِ قَدْ تَقَدَّمَا
فَمَنْ بِإِرْثٍ لَمْ يَكُنْ يُمَتَّعُ ١١٠ فَحَجْبُهُ لِغَيْرِهِ مُمْتَنِعُ

---

بەشەکان گشت میراتەکە دەگرن‌و، مامەکەش بێ بەش دەبێ، چونکە بنچینەی مەسەلەکەیان لە شەشە —کە بەشی برایەکەی لێ دەردەچێ— بەم شێوەیە:

٦، میراتگر ——— برای لە دایکی، مێرد، دایك، مام
١ ×، بەشە میرات ——— شەشێك، نیوە، سێیەك، پشتێیە
٦ ÷ ——— ١ + ٣ + ٢ + بێ بەش = ٦

**پێناسە:** (عَصَبَةُ الشَّخْصِ عَلَى مَا ذَكَرُوا) میراتگری پشتێ —کە پێی دەگوترێ (عَصَبَة)— هەروەك زانایان باسیان کردوە (هُوَ الَّذِي لَيْسَ لَهُ مَقَدَّرٌ) ئەو میراتگرەیە، کە لە قورئان‌و حەدیسدا بەشە میراتی بۆ دیار نەکرابێ، بەڵکو (يَرِثُ مَا خَلَّفَهُ مَنْ يَقْضِي) گشت ئەو میراتە دەگرێ: کە مردووەکە بەجێی هێشتوە: ئەگەر هیچ خاوەن بەشێکی لەگەڵدا نەبێ (أَوْ يَرِثُ البَاقِيَ بَعْدَ الفَرْضِ) یان ئەوەندە میراتە دەگرێ: کە لە پاش خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە، لەو حاڵەتەی خاوەن بەشی لەگەڵدایە.

**ئینجا بزانە:** (عَصَبَة) میراتگری پشتێ سێ جۆرە: **یەکەم:** (عَصَبَةٌ بِنَفْسِه) کە هەر بە خودی خۆی میراتگری پشتێ بێ: وەك ئەو نێرینەیەی نەژادی بگاتە مردووەکەو، هیچ مێیینەکیش لە نێوان ئەوی‌و مردووەکەدا نەبێ: وەك کوڕو باوك‌و براو مام‌و...هتد. **دووەم:** (عَصَبَةٌ بِالغَيْر)ئەو مێیینەیە کە بەهۆی نێرینەیەك ببێتە میراتگری پشتێ: وەك خوشکەکان‌و کیژەکانی مردووەکە بە هۆی برای خۆیان دەبنە (عَصَبَة) میراتگری پشتێ. **سێیەم:** (عَصَبَةٌ مَعَ الغَيْر): ئەو مێیینەیە کە بە هۆی کۆبوونەوەی لەگەڵ مێیینەیەکی تردا ببێتە میراتگری پشتێ: وەك خوشکەکانی مردووەکە بەهۆی کۆبوونەوەیان لەگەڵ کیژەکانی، یان کیژە کوڕەکانی مردووەکە دەبنە (عَصَبَة) میراتگری پشتێ، هەروەك لە (مغنی)و (حاشیة البقری)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿**ئاگاداری**﴾: (الإِرْثُ شَرْطُ الْحَجْبِ) میراتگرتنی قەدەغە کەرەکە مەرجە: بۆ قەدەغە کردنی کەسێکی تر لە میرات (فِي جَمِيعِ مَا هُنَا) لە هەموو ئەوانەی لێرەدا باس کران (وَ) هەم لە هەموو ئەوانەی کە (فِي الفُرُوضِ قَدْ تَقَدَّمَا) لە باسی بەشە میراتەکاندا ڕابران، کەوابوو: (فَمَنْ بِإِرْثٍ لَمْ يَكُنْ يُمَتَّعُ) هەر کەسێك بەهۆی کوشتن، یان کافر بوون،

وَاسْـــتَثْنِ تِسْـــعَ صُـــوَرٍ قَـــدْ وَجَبَـــا ١١١فِيـــــهَا لِغَـــيْرِ وَارِثٍ أَنْ حَجَبَـــــا

فَـــابْدَأْ بِـــأُمٍّ مَـــعَ ذِي أُبُـــوَّةْ ١١٢وَعَـــدَدٍ مِمَّـــنْ لَـــهُ أُخُـــوَّةْ

وَثَـــنِّ بِـــالأُمِّ وَفَرْعَيْـــهَا وَجَـــدّْ ١١٣ثَالِثَـــةٌ وَلَـــدُ أُمٍّ وَوَلَـــدْ

لأَبَوَيْـــــنِ أَوْ أَبٍ وَوَالِـــــدَةْ ١١٤وَالجَـــدُّ، وَالرَّابِعَـــةُ الْمُعَـــادَدَةْ

تَأْتِيكَ فِـــي مَبْحَـــثِ إِخْـوَةٍ وَجَـــدّْ ١١٥خَامِسَـــةٌ أُمٌّ إِلَـــى السُّـدْسِ تُـــرَدّْ

---

یان کۆیلەیی میرات نەگرێ، ئەوە هەبوونی وەك نەبوونە، کەواتە: (فَحَجْبُهُ لِغَيْرِهِ مُمْتَنِعُ) ناتوانێ: هیچ میراتگرێکی جگە لە خۆی بێ بەش بکا، یان بەشی کەم بکاتەوە، هەروەها هەر میراتگرێکیش بە هۆی میراتگرێکی تر بێ بەش بوو بێ، ئەویش ناتوانێ هیچ میراتگرێك بێ بەش بکا، یان بەشی کەم بکاتەوە، بەلاّم (وَاسْتَثْنِ تِسْعَ صُوَرٍ) لەو (قاعدة)یەی دووەم نۆ وێنە جیا بکەوە: کە (قَدْ وَجَبَا فِيهَا) لەو نۆ وێنەیەدا وەها جێگیر بووە (لِغَيْرِ وَارِثٍ أَنْ حَجَبَا) ئەو کەسەی میراتگر نیە میراتگری قەدەغە کردوە: یان لە گشت میراتەکە، یان لە بەشێکی میراتەکە.

١- (فَابْدَأْ) دەست بە وێنەی یەکەم بکە: (بِأُمٍّ مَعَ ذِي أُبُوَّةْ وَعَدَدٍ مِمَّنْ لَهُ أُخُوَّةْ) بە دایك و باوك و ژمارەیەك خوشك و برا. واتە: خوشك و برایەکان بە هۆی باوك بێ بەش دەبن، بەلاّم ئەوانیش بەشی دایك کەم دەکەنەوە: لە سێیەکەوە بۆ شەشێك.

٢- (وَثَنِّ) وێنەی دووەم بێنە: (بِالأُمِّ وَفَرْعَيْهَا وَجَدّْ) بە دایك و باپیرەو دوو خوشك، یان دوو برای تەنها لە دایکی. واتە: خوشکەکان و برایەکانی لە دایکی بە هۆی باپیرە بێ بەش دەبن، بەلاّم ئەوانیش بەشی دایك کەم دەکەنەوە: لە سێیەکەوە بۆ شەشێك.

٣- (ثَالِثَةٌ) وێنەی سێیەم: (وَلَدُ أُمٍّ وَوَلَدٌ لأَبَوَيْنِ أَوْ أَبٍ وَوَالِدَةٌ وَالجَدُّ) برایەکی تەنها لە دایکی و برایەکی لە دایکی و باوکی، یان تەنها لە باوکی و دایك و باپیرە. واتە: برای تەنها لە دایکی بە هۆی باپیرە بێ بەش دەبێ، بەلاّم ئەویش لەگەڵ برای لە باوکی وێکڕا بەشی دایك کەم دەکەنەوە: لە سێیەکەوە بۆ شەشێك.

٤- (وَالرَّابِعَةُ) وێنەی چوارەم: (الْمُعَادَدَةْ) مەسەلەکەی ژماردراوە: کە (تَأْتِيكَ فِي مَبْحَثِ إِخْوَةٍ وَجَدّ) لە باسی براو باپیرەدا دێ: وەك باپیرەو برایەکی لە دایکی و باوکی و برایەکی تەنها لە باوکی. واتە: برای تەنها لە باوکی بە هۆی برای لە دایکی و باوکی بێ بەش دەبێ، بەلاّم هەردوو برایەکەش وێکڕا بەشی باپیرەکەم دەکەنەوە: لە نیوەوە بۆ سێیەك.

بِـالأَخِ مِـنْ أَصْلَيْـنِ مَـعْ أَخٍ لأَبْ ١١٦ سَادِسَـةٌ عِـرْسٌ أَصَابَـهَا عَطَـبْ
وَخَلَّفَـتْ شَـقِيقَةً وبَعْـلا ١١٧ والأَخَ مِـنْ أَبٍ وَأُمّـاً ثُكْلَـى
وَمَثَّلُـوا سَـابِعَةً بِسِـتِّ ١١٨ زَوْجٍ وَأُمٍّ وَأَبٍ وَبِنْـتِ
وَابْـنِ ابْـنِ انْضَمَّـتْ إِلَيْـهِ بِنْـتُ ١١٩ عَـمٍّ لَـهُ عَصَّبَـهَا أَوْ أُخْـتُ
فَأُخْتُـهُ أَوْ بِنْـتُ عَـمٍّ لَـوْلاَ ١٢٠ تَعْصِيبُـهُ فَـازَتْ بِفَـرْضٍ عَـوْلاَ
ثَمِّـنْ بِـزَوْجٍ وَشَـقِيقَةٍ وَأَخْ ١٢١ وَالأُخْتِ عَـنْ أُمٍّ كِلاَهُمَـا انْفَسَـخْ

---

٥- (خَامِسَةٌ) وێنەی پێنجەم: (أُمٌّ إِلَى السُّدْسِ تُرَدّ) دایك بەشی کەم دەبێتەوە: لە سێیەکەوە بۆ شەشێك (بِالأَخِ مِنْ أَصْلَيْنِ مَعْ أَخٍ لأَبٍ) بە هۆی برایەکی لە دایکیو باوکی لەگەڵ برایەکی تەنها لە باوکی، هەرچەند ئەمەشیان بەویتر بێ بەش دەبێ.
٦- (سَادِسَةٌ) وێنەی شەشەم: (عِرْسٌ أَصابَهَا عَطَبٌ) ژنێك مردنی تووش بووەو (وَخَلَّفَتْ شَقِيقَةً وَبَعْلاَ وَالأَخَ مِنْ أَبٍ وَأُمّاً ثُكْلَى) خوشکێکی لە دایکیو باوکیو مێردو برایەکی تەنها لە باوکیو دایکێکی زگسووتاوی بەجێ هێشتوون. واتە: برایەکە بە هۆی داگرتنی گشت میراتەکە بێ بەش دەبێ، بەڵام ئەویش لەگەڵ خوشکەکە وێکڕا بەشی دایك کەم دەکەنەوە: لە سێیەکەوە بۆ شەشێك.
٧- (وَمَثَّلُوا سَابِعَةً بِستٍّ) وێنەی حەوتەمیان بە شەش کەس هێناوە: (زَوْجٍ وَأُمّ وَأَبٍ وَبِنْتٍ وَابْنِ ابْنِ انْضَمَّتْ إِلَيْهِ بِنْتُ عَمٍّ لَهُ عَصَّبَهَا أَوْ أُخْتٌ) مێردو دایكو باوكو کیژو کوڕی کوڕێك کە کیژە کوڕێکی لەگەڵدا بێو بیکاتە میراتگری پشتێ: جا خوشکی خۆی بێ، یان ئامۆزای بێ، ئەوە خاوەن بەشەکان گشت میراتەکە دەگرنو کوڕە کوڕەکەش بێ بەش دەبێ، ئینجا (فَأُخْتُهُ أَوْ بِنْتُ عَمٍّ) خوشکەکەی، یان ئامۆزایەکەشی (لَوْلاَ تَعْصِيبُهُ) ئەگەر کوڕە کوڕەکە نەیکردبا میراتگری پشتێ ئەو بێ بەش نەدەبوو، بەڵکو (فَازَتْ بِفَرْضٍ عَوْلاً) بەهۆی زیدە کردنی (عَوْل) بۆ پانزە شەشێکی بۆ دادەندراو بەختەوەر دەبوو، جا هەرچەند ئەم کوڕە کوڕە بە خۆی بێ بەشە، بەڵام بووەتە هۆی بێ بەشکردنی ئەو کیژە کوڕەش، بۆیێ پێی دەگوترێ: (الأَخُ الْمَشْوم) برای بەدیۆم.
٨- (ثَمِّنْ) وێنەی هەشتەم بێنە: (بِزَوْجٍ وَشَقِيقَةٍ وَأَخٍ وَالأُخْتِ عَنْ أُمٍّ كِلاَهُمَا انْفَسَخْ) بە مێردو خوشکێکی لە دایکیو باوکیو خوشکێكو برایەکی تەنها لە باوکی. واتە: میراتەکە گشتی بۆ مێردو خوشکی لە دایکیو باوکییەو، برایەکەش بێ بەش دەبێو،

وَوَلَـــــدَا أُمٍّ وَأُمٌّ تاسِـــــــعَةْ ١٢٢ مَعْ عُصْبَـــةٍ مِـــنْ بَعْـدِ زَوْجٍ وَاقِعَـةْ

هَذا بَيَانُ تَرْتِيبِ العَصَبَات

لِلْعَصَبَـــاتِ ذَكَـــرُوا تَرْتِيبــا ١٢٣ مَنْ حَـادَ عَنْـهُ لَـمْ يَكُـنْ مُصِيبـا

وَهُـــمْ أُولاء أَوَّلاً فَـــأَوَّلاَ ١٢٤ الإبْـنُ، فابْنُـــهُ وَلَـــوْ تَسَـــفَّلاَ

فَـــالأَبُ، فَـــالْجَدُّ وَلَـــوْ عَـــلاَ، وَإِنْ ١٢٥ أَخٌ فَصَـــاعِدًا بِجَـــدٍّ يَقْـــتَرِنْ

---

جا چونكە خوشكەكەی خۆیشی كردۆتە میراتگری پشتێ ئەویش بێ بەش دەبێ، بەڵام ئەگەر خوشكەكەی نەكردبا میراتگری پشتێ ئەویش بە (عَوْل) شەشێكی بۆ دادەندرا، بۆیێ ئەم برایەش پێی دەگوترێ: بەدیۆم.

٩- (وَوَلَدَا أُمٍّ وَأُمٌّ تَاسِعَةٌ) نۆیەم: دوو برای تەنها لە دایكیو دایكو هەم (مَعَ عُصْبَةٍ مِنْ بَعْدِ زَوْجٍ وَاقِعَةٍ) ئەو كۆمەڵەی لە دوای مێردەكەنە لە هەشتەمەكەدا: كە خوشكێكی لە دایكی باوكیو خوشكێكو برایەكی تەنها لە باوكییە، واتە: وەك مەسەلەی هەشتەم ئەم برایە بەدیۆمە بە خۆی بێ بەشەو، خوشكەكەیشی دەكاتە میراتگری پشتێو بێ بەشی دەكا، ئەگەر ئەو برایە نەبووایە خوشكەكە بە (عَوْل) شەشێكی بۆ دادەندرا.

## ﴿هذا بَيَانُ تَرْتِيبِ العَصَبَات: ئەمە ڕوونكردنەوەی ڕیزی (عَصبَة)كانە﴾

بزانە: هەر بە بەڵگەی ﴿فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ﴾ی حەدیسەكەی ڕابردوو: میراتگرەكانی پشتێ بە گوێرەی نزیكتریی خۆیان یەكتری بێ بەش دەكەن، كەواتە: تا لایەنی بەهێزترو نزیكتر هەبێ، لایەنەكەی تر میرات ناگرێ، چونكە میراتگرایەتی پشتێ شەش لای هەیە: كوڕایەتی، ئینجا بابایەتی، ئینجا باپیرایەتیو برایەتی، ئینجا كوڕە برایەتی، ئینجا مامایەتی، ئینجا كوڕە مامایەتی، ئینجا ئازاد كردنی كۆیلە، هەروەك لە (شَرْح الرحبية)دا ڕوون كراوەتەوە، ئینجا بە گوێرەی ئەو لایەنانە (لِلْعَصَبَاتِ ذَكَرُوا تَرْتِيبا) بۆ میراتگرەكانی پشتێ ڕیزی وەپێش خستنیان لە میراتگرتندا داناوە (مَنْ حَادَ عَنْهُ لَمْ يَكُنْ مُصِيبا) هەر كەسێك لەو دانانە لابدا ناگاتە ڕێگەی ڕاست.

(وَهُمْ أُولاءِ أَوَّلاً فَأَوَّلاً) میراتگرەكانی پشتێ ئەوانەی داهاتوون یەك لە دوای یەك بەم ڕیزە: (الإِبْنُ، فابْنُهُ وَلَوْ تَسَفَّلاَ) كوڕ، ئینجا كوڕی كوڕ، هەرچەند بەرەو خوارتریش بێ (فَالأَبُ) ئینجا باوك (فَالْجَدُّ وَلَوْ عَلاَ) ئینجا باپیرە، واتە: باوكی باوكو بەسەرەوەتر (وَإِنْ أَخٌ فَصاعداً بِجَدٍّ يَقْتَرِنُ) ئەگەر برایەك، یان زیاتر لەگەڵ باپیرەدا بوون، ئەوە (فَسَوْفَ

فَسَــوْفَ يَــأْتِي حُكْــمُ ذَا فَلْــيُرْتَقَبْ ١٢٦ ثُـــمَّ أَخٌ لأَبَوَيْـــــنِ، فَـــــلأَبْ
فَابْنَاهُمَـــا كَــذَاكَ فِـــي الـــتَّرَتُّبِ ١٢٧ فَــالْعَمُّ مِــنْ أَصْلَيْــنِ، ثُــمَّ مِــنْ أَبِ
فَابْنَاهُمَـــا كَــذَا، فَعَـــمُّ الْوَالِـــدِ ١٢٨ ثُــمَّ ابْنُــهُ، فَعَــمُّ جَــدِّ الْـــهَامِدِ
ثُــمَّ ابْنُــــهُ وَهَكَــــذَا، لَكِنَّمَــــا ١٢٩ إِبْــنُ أَخٍ مِــنْ وَالِــدٍ قَــدْ قُدِّمَـــــا
حَتْماً عَلَــى ابْــنِ ابْــنِ أَخٍ مُنْتَسِــبِ ١٣٠ لأَبَوَيْــــنِ، وَابْــــنُ عَـــــمٍّ لأَبْ
مُقَــدَّمٌ عَلَــى ابْــنِ نَجْــلِ عَــمِّ ١٣١ مُنْتَســــبِ لِوَالِـــــــدٍ وَأُمِّ

---

يَأْتِي حُكْمُ ذَا فَلْيُرْتَقَبْ) له باسی (میراتی باپیره)دا بڕیاری کۆبوونەوەیان دێ، با چاوەڕوان بکرێ (ثُمَّ أَخٌ لأَبَوَيْنِ، فَلأَبٍ) ئینجا ئەگەر باپیره نەبوو، ئەو کاتە برای له دایکیو باوکی، ئینجا برای تەنها له باوکی (فَابْنَاهُمَا كَذَاكَ فِي التَّرَتُّبِ) ئینجا کوڕە برایەکانیش وەك باوکی خۆیانن لەو ڕیزەدا، واتە: ئینجا کوڕە برای له دایکیو باوکی، ئینجا کوڕە برای تەنها له باوکی (فَالْعَمُّ مِنْ أَصْلَيْنِ، ثُمَّ مِنْ أَبٍ) ئینجا مامی له دایکیو باوکی، ئینجا مامی تەنها له باوکی (فَابْنَاهُمَا كَذَا) ئینجا کوڕە مامەکانیش هەر بەو ڕیزە، واتە: ئینجا کوڕە مامی له دایکیو باوکی، ئینجا کوڕە مامی تەنها له باوکی (فَعَمُّ الْوَالِدِ) ئینجا مامی باوکی مردووەکە له دایکیو باوکی، ئینجا تەنها له باوکی (ثُمَّ ابْنُهُ) ئینجا کوڕە مامی باوکی مردووەکە بەو ڕیزەی ڕابرا (فَعَمُّ جَدِّ الْهَامِدِ) ئینجا مامی باپیرەی مردووەکە (ثُمَّ ابْنُهُ) ئینجا کوڕە مامی باپیرەی مردووەکە بەو ڕیزەی ڕابرا... (وَهَكَذَا) بەو شێوەیە گشت میراتگرەکانی تری پشتێ.

**ئینجا بزانە:** لەو ڕیزەی ڕابردوو بۆمان ئاشکرا بوو: کە میراتگرێکی دوور له لایەکی نزیکەوە وەك کوڕی کوڕی کوڕو بەرەو خوارتریش، له پێشترە له میراتگرێکی نزیك له لایەکی دوورەوە: وەك برای مردووەکە، (لَكِنَّمَا) بەڵام له یەك لاوە ئەوها نیە، بەڵکو هەر نزیکترە کە -هەرچەند بێ هێزیش بێ- له پێشترە له دوورترەکە هەرچەندە بەهێزتریش بێ: وەك (إِبْنُ أَخٍ مِنْ وَالِدٍ قَدْ قُدِّمَا حَتْماً) کوڕە برای تەنها له باوکی وەپێش خستراوە بە واجبی -هەرچەند بێ هێزیشە- (عَلَى ابْنِ ابْنِ أَخٍ مُنْتَسِبٍ لأَبَوَيْنِ) لەسەر کوڕی کوڕی برای له دایکی باوکی -هەرچەند بەهێزتریشە- چونکە ئەمەیان پلەیەك دوورترەو، کوڕە برایەتیش بە یەك لا داندراوەو، تەنها نزیکی ڕەچاو دەکرێ (وَ) هەروەها (ابْنُ عَمّ لأَبِ مُقَدَّمٌ) کوڕە مامی تەنها له باوکی -هەرچەندە بێ هێزیشە- وەپێش خستراوە (عَلَى ابْنِ نَجْلِ عَمِّ مُنْتَسِبٍ لِوَالِدٍ وَأُمِّ) لەسەر کوڕی کوڕی مامی له

فَمُعْتِــقٌ كَمَــــا يَجِـــي مُفَصَّــــلاَ ١٣٢ مِنْ بَعْـــدُ فِـــي مَبْحَـــثِ إِرْثٍ بِــــالوَلاَ
فَبَيْــتُ مَــالٍ ذُو انْتِظَــــامٍ يَبْــــدُو ١٣٣ ثُــمَّ عَلَــى أَهْــلِ الفُــرُوضِ الــــرَّدُّ
بِنِسْــبَةِ الفُــرُوضِ مِثْــلَ مَــا عُلِــمْ ١٣٤ وَبَعْدَ أَهْلِ الــــرَّدِّ أَصْحَــابُ الرَّحِــمْ

---

دایکیو باوکی –هەرچەندە بەهێزتریشە– چونکە ئەمەیان پلەیەك دوورترەو، کوڕە مامایەتیش بەیەك لا داندراوەو، تەنها نزیکی ڕەچاو دەکرێ.

(فَمُعْتِقٌ) ئینجا ئەگەر (عَصَبَة) میراتگری پشتێ لە نەژادی مردووەکە نەبوو، ئەو کاتە ئازاد کەری کۆیلە مردووەکە میراتگری پشتێیە (كَمَا يَجِي مُفَصَّلاً مِنْ بَعْدُ) هەروەك بە درێژی دێ لە مەودوا (فِي مَبْحَثِ إِرْثٍ بِالوَلاَء) لە باسی میراتگرتن بەهۆی ئازاد کردنی کۆیلە (فَبَيْتُ مَالٍ) ئینجا ئەگەر ئازاد کەرەکەش نەبوو، ئەو کاتە میراتەکە دەدرێتە (بَيْت الْمَال) بەو مەرجەی (ذُو انْتِظَامٍ يَبْدُو) کاروبارەکەی بەڕێکی دیار بێ (ثُمَّ) ئینجا ئەگەر (بَيْـت الْمَـال) نەبوو –وەك ئەم سەردەمە– (عَلَى أَهْلِ الفُرُوضِ الرَّدُّ) میراتە زێدەکە دووبارە بۆ خاوەن بەشەکان ڕەد دەکرێتەوە (بِنِسْبَةِ الفُرُوضِ مِثْلَ مَا عُلِمْ) بە گوێرەی بەشە میراتەکانی خۆیان وەك لەمەوپێش زاندرا (وَبَعْدَ أَهْلِ الرَّدِّ أَصْحَابُ الرَّحِمِ) ئینجا ئەگەر هیچ میراتگرێکی خاوەن بەشیش نەبوو، ئەو کاتە دەدرێتە خزمەکانی (ذَوِي الأَرْحَام)، هەروەك ڕابرا، جا ئەگەر (ذَوِي الأَرْحَام)ش نەبوون، ئەو کاتە میراتەکە لە بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرف دەکرێ، هەروەك لە (ئاگاداری)یەکەی پێش (ذَوِي الأَرْحَام)دا ڕوونمان کردەوە، والْحَمْدُ لله تَعالَى.

**پاشکۆ:** ئەگەر کۆمەڵێك: کوڕی کوڕ، یان کوڕە برا، یان کوڕە مام لە یەك پلەدا –وێکڕا– کۆبوونەوە، ئەوە گشت میراتەکە، یان پاشماوەکەی بە یەکسانی بەسەر ژمارەی سەرەکانیاندا بەش دەکرێ، **بۆ وێنە:** ئەگەر چوار کوڕی کوڕی لە پاش بەجێمان: یەکێکیان لە کوڕێك بوو، سێیەکانی تریش لە کوڕێکی تر بوون، ئەوە میراتەکە بەسەر هەر چواریاندا بە یەکسانی بەش دەکرێ، نەکەی ئەوەی بە تەنها لە کوڕێکە نیوەی هەبێو، سێیەکانی تریش وێکڕا نیوەکەی تریان هەبێ، چونکە گشتیان لەیەك پلەدانەو بە لایەنی کوڕە کوڕایەتی میرات لە مردووەکە دەگرن، هەروەها کوڕە برایەکانو کوڕە مامەکانیش بەو شێوەیە –بە یەکسانی– میراتەکە دەگرن، هەروەك لە (حاشیة البقری)دا ڕوون کراوەتەوە.

## هَذا بَيَانُ إرْثِ الأَوْلادِ وأَوْلاَدِهِمْ

اَلْمَـــالُ بِـــابْنٍ وَبَنـــــينَ اسْــــتُغْرِقَا ١٣٥ وَلاَبْنَــــةٍ فَصــــــاعِداً مَـــــا سَــــــبَقَا

وَإنْ هُمَا يَجْتَمِعَـــــا حَـــازُوا النَّشَـــبْ ١٣٦ وَذَكَـــــرٌ كَـــــأُنْثَيَيْنِ يُحْتَسَـــــــبْ

كَالْفَرْعِ فَـــرْعُ الإبْـــنِ فِيمَـــا ذُكِـــرَا ١٣٧ لَـــوْ وَجَـــدَا وَالفَـــرْعُ كَـــانَ ذَكَـــرَا

---

### ﴿هَذا بَيَانُ إرْثِ الأَوْلادِ وأَوْلاَدِهِمْ: ئەمە ڕوونكردنەوەی میراتی منداڵەكان و منداڵی منداڵەكانە﴾

(اَلْمَالُ بِابْنٍ وَبَنِينَ اسْتُغْرِقَا) گشت میراتەكە بە تاكە كوڕێكو، بە دوو كوڕو بە زیاتریش دادەگرێتەوەو گشتی بۆ ئەوانە، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام (وَلاَبْنَةٍ فَصاعداً مَا سَبَقَا) تاكە كیژێك نیوەی هەیەو، دوو كیژو زیاتریش دوو سێیەكیان هەیە –هەروەك ڕابرا– بەلاَم (وَإنْ هُمَا يَجْتَمِعَا) ئەگەر كوڕەكان و كیژەكان وێكڕا كۆبوونەوە، ئەو كاتە (حَازُوا النَّشَبَ) گشت ماڵەكە –واتە: میراتەكە– دەگرن و (وَذَكَرٌ كَـأُنْثَيَيْنِ يُحْتَسَـبُ) هەر نێرینەیەكیش وەكو دوو مێینە دەژمێردرێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾ لە بارەی منداڵەكانتان خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەكا: نێرینە وەك بەشی دوو مێینەی هەیە لە میراتەكەتاندا. **ئینجا بزانە:** بۆیێ نێرینە دوو هەندێ مێینەی بۆ دانراوە، چونكە نێرینە (جهاد)ی لەسەر واجبەو، خوێنی مرۆڤی كوژراوی لەسەرەو، دوو ئەركی بەخێوكردنی –خۆی و ژنەكەی– لەسەرە، بەلاَم مێینە ئەوانەی لەسەر نیە، بەڵكو ئەگەر مێردی هەبێ، بەخێو كردنی خۆیشی لەسەر نیە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

﴿**ئاگاداری**﴾ ئەو یاسا دەستكردەی ئێستا لە دادگا ستەمكارەكاندا هەیە: كە بە یەكسانی میرات دەداتە نێرینەو مێینە، یاسایەكی دژ بە قورئانی پیرۆزەو، مێینەكەش –جگە لە بەشی خۆی– میراتەكەی لێ حەلاَڵ نابێ، بەڵكو ئەگەر ئەو یاسایە بەڕەوا بزانێ و باوەڕی بەو شەریعەتەی ئیسلام نەبێ، ئەوە كافریش دەبێ، ئەگینا: (ظالم)و (فاسق)ە، هەروەك لە باسی پێنج مافەكانی ڕابردوودا ڕوونمان كردەوە.

(كَالْفَرْعِ فَرْعُ الإبْنِ) منداڵەكانی كوڕی مردووەكە –هەر كاتێك منداڵەكانی خودی مردووەكەیان لەگەڵدا نەبێ– ئەوانیش وەكو منداڵەكانی خودی مردووەكەنە (فیمَا

ذُكَرًا) لەو ڕوونكردنەوەی ڕابردوودا، بە (إجماع)ی زانایـان، واتـە: تاكـە كـوڕە كوڕێكو هەم زیاتریش گشت میراتەكە دەگرنو، تاكـە كیـژە كوڕێك نیوە دەگـرێو، دوو كیـژە كوڕو زیاتریش دوو سێیەك دەگرنو، ئەگەر نێرینــەو مێیینـەكانیان وێكـڕا كۆبوونـەوە، ئەوە هەر نێرینەیەك وەك بەشی دوو مێیینەی هەیە، بەلام (لَـوْ وَجَـدَا) ئەگـەر هـەردوو چینەكان، واتە: منداڵەكانی خودی مردووەكەو منداڵەكانی كـوڕی مردووەكـە –وێكـڕا– هـەبوون، ئـەو كاتـە ئـەو سـێ حاڵـەتانـەی داهاتوویـان هەنـەو، لـە هـەر حاڵـەتێكدا بـە شێوەیەك ڕەفتاریان لەگەڵ دەكرێ:

**حاڵەتی یەكەم:** (وَالفَرْعُ كَانَ ذَكَرَا) ئەگەر منداڵەكانی خودی مردووەكە نێرینەیەك، یان زیاتر بوو: بە تەنها، یان لەگەڵ مێیینە، ئەو كاتە (حَجَـبَ فَـرْعَ الإبْـنِ) نێرینەكـە گشت منداڵـەكانی كـوڕی مردووەكـە بـێ بـەش دەكـا –نێرینــەكانیان‌و مێیینــەكانیان– بـە (إجمـاع)ی زانایـانی ئیسـلام. كـەوابوو: ئـەو یاسـا دەسـتكردەی ئێسـتا لـە دادگـا ستەمكارەكاندا هەیە: كە ئەگەر منداڵەكانی كوڕی مردووەكـە بـاوكی خۆیـان نـەمابێ، ئەوان لە جێی باوكیـان دادەندرێـن، واتـە: بـە واجبـی بەشـە میراتیـان بـۆ دادەنـدرێ، هەرچەند خودی مردووەكەش كوڕی خۆی هـەبێ، جا بـەم بەشـە ناشـەرعی‌یە دەڵێـن: (وەسێتی واجب). ئەو یاسایە بە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامەو، دژ بە حەدیسـەكەی ﴿فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ﴾ی ڕابردووە، كەواتـە: ئەگـەر مردووەكـە لـە ژیانیـا وەسـێتەكەی نەكردبێ، بەشە میراتەكەش نابێتە ملكی منداڵەكانی كوڕەكـەو لێیـان حەڕامـە، چونكـە وەسێتی واجب بە ئایەتەكانی میرات (نَسْخ) بۆتەوە، هـەروەك لـە (تَفْسِیر إبـن كَثـیر)و (إرشادُ السّاری)دا ڕوون كراوەتەوە.

**حاڵەتی دووەم:** (أَوْ أُنْثَى) ئەگەر منداڵەكانی خودی مردووەكە تاكە كیژێك، یـان زیـاتر بوو، واتە: هیچ نێرینەیەك نەبوو، ئـەو كاتـە نیوەی میراتەكـە بـۆ كیژەكەیـە، یـان دوو سێیەكی میراتەكە بۆ دوو كیژو زیاترە، ئینجا (فَقُلْ لِوَلَدِ إبْنٍ) بە منداڵـی كوڕەكـە بڵـێ: (لَكَ مَا عَنْهَا فَضِلْ) پاشماوەكە –كە لە نیوەكە، یان لە دوو سێیەكەكە زیاد بووە– بـۆ تۆیە، بەو مەرجەی منداڵەكانی كوڕەكـە: نـێر بـن، یـان نـێرو مـێ وێكـڕا بـن، جـا هـەر نێرینەیەك وەك بەشی دوو مێیینەی دەدرێتێ.

ئینجا لە هەر حاڵەتێكدا منداڵەكانی كوڕەكەو بـەرەو خوارتـر وێكـڕا كۆبوونـەوە، ئـەوە نێرینەكانیان مێیینەكانی لە پلەی خۆیان بەرەو خوارتر –وەكو كیژە برای خۆیان– بێ بـەش دەكـــەن، هـــەروەك لـــە (تـــحـفـــة)و (مـــغـــنـــی)دا فـەرموویانە.

وَعَصَّبَ الذَّكَرُ مَنْ فِي رُتْبَتِهِ ١٣٩ كَأُخْتِهِ، أَوْ فَوْقَهُ كَعَمَّتِهِ
إِنْ لَمْ تَحُزْ سُدُسَ مَالٍ إِرْثَا ١٤٠ وَإِنْ يَكُنْ وَلَدُ الابْنِ أُنْثَى
حَازَتْ مَعَ ابْنَةٍ كَمَا تَقَرَّرَا ١٤١ سُدْساً وَلاَ شَيْءَ لَهَا مَعَ أَكْثَرَا

---

بەڵام (وَعَصَّبَ الذَّكَرُ مَنْ فِي رُتْبَتِهِ) نێرینەکە ئەو مێیینەی لە پلـەی خۆیـەتی دەیکاتـە (عَصَبَة) میراتگری پشتێ: (كَأُخْتِه) وەکو خوشکی خۆیو کیژە مامی خـۆی (أَوْ فَوْقَـهُ) یان ئەگەر مێیینەکـە لـە خۆیشی بەسـەرەوەتر بـێ: (كَعَمَّتِـهِ) وەکـو خوشـکی بـاوکی خۆیو کیژە مامی باوکی خۆی، هەر دەیکاتە (عَصَبَة) بەڵام ئەمەیان (إِنْ لَمْ تَحُزْ سُدُسَ مَالٍ إِرْثَاً) بەو مەرجـەی شەشـێکی ماڵەکـە –کـە تەواوکـەری دوو سـێیەکە– بـە مـیرات نـەگرێ: وەکـو دوو کیـژی مردووەکـەو کیـژە کـوڕی مردووەکـەو کوڕی کـوڕی کـوڕی مردووەکە، واتە: دوو کیژەکان دوو سێیەک دەگرنو، ئەم نێرینەیەش ئەو کیژە کوڕە – کە بە پلەیەك لە خۆی بەسەرەوەترە– دەیکاتە (عَصَبَة)و وێکڕا پاشماوەکەی میراتەکە دەگرن، بەڵام ئەگەر شەشێکی دەگرت، ئەو کاتە پێویست ناکا بیکاتە (عَصَبَـة): وەکـو کیژێکی مردووەکەو کیژە کوڕێکی مردووەکەو کوڕی کـوڕی کـوڕی مردووەکـە، چونکـە کیژی مردووەکە نیـوەی هەیـەو، کیـژە کوڕەکـەش شەشـێکی هەیـە –تەواوکـەری دوو سێیەك–و، پاشماوەکەش بۆ نێرینەکەیە.

(وَ) هەر لەو حاڵەتەی دووەم: (إِنْ يَكُنْ وَلَدُ الابْنِ أُنْثَى) ئەگەر منداڵەکانی کوڕەکە تەنها مێیینەیەك، یان زیاتر لە مێیینەیەك بوو، واتە: هیچ نێرینەیەك نەبوو، ئەو کاتە (حَازَتْ مَعَ ابْنَةٍ كَمَا تَقَرَّرَا سُدْساً) شەشـێکی میراتەکـە دەگـرێ –لـەو حاڵەتـەی تاکـە کیژێکـی مردووەکە هەیە– هەروەك بڕیار درا، جا ئەگـەر لـە کیـژە کوڕێـك زیـاتر بـوون، ئـەوە گشتیان لە شەشێکەکەدا هاوبەشنو ئەو شەشێکەش لەگەڵ نیوەکەی کیژەکـە دەبێتـە تـەواوکـەری دوو سـێیەك، بـە (إجمـاع)ی زانایـانو هـەم حەدیسـەکەی (إبـن مسـعود)ی ڕابردوو، لە باسی (شەشێك)دا.

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر خودی مردووەکە دوو کیژ، یان زیاتری هەبوون، ئەو کاتـە دوو سێیەکەکە دەگرنو، مێیینەکانی کوڕی مردووەکـەش بـە هـۆی دوو کیـژی مردووەکـە بێبەش دەبن بە (إجماع)ی زانایان، هەروەك دەفەرموێ: (وَلاَ شَيْءَ لَهَا مَعَ أَكْثَرَا) کیژە کوڕەکە هیچ بەشە میراتی نیە ئەگەر لەگەڵ زیاتر لە کیژێکـی مردووەکـە دابـێ، مەگـەر نێرینەیەکی لە پلەی خۆی، یان بەرەو خوارتری لەگەڵدا بێو بیکاتە مـیراتگری پشـتێ،

هَـــذَا الَّـــذِي يُقْضَـــى بِـــهِ وَيُحْكَـــمُ ١٤٢ فِـــي الكُـــلِّ مِـــنْ طَبَقَتَيْـــنِ مِنْـــهُمُ

هَذا بَيَانُ إرْثِ الأُصُولِ

يَــرِثُ بِــالفَرْضِ فَقَــطْ أَبٌ إِذَا ١٤٣ كَانَ مَــعَ ابْــنِ مَــنْ بِلَحْــدٍ نُبِــذَا

كَــذَا بِتَعْصِيــبٍ فَقَــطْ إِنْ عُدِمَــا ١٤٤ لِلْمَيْــتِ فَــرْعٌ وَارِثٌ، وَبِــهِمَا

مَــعَ ابْنَــةٍ أَوْ إِبْنَــةِ ابْــنٍ، ولأُمّ ١٤٥ ثُلُثٌ أَوْ سُدْسٌ عَلَــى مَــا قَــدْ عُلِمْ

---

ئەو كاتە بێ بەش نابێ، بەڵكو لەگەڵ نێرینەکە -وێکڕا- پاشماوەکە دەگرن، جا بزانە: ئەم نێرینەیە پێی دەگوترێ: (الأَخُ الْمُبَارَك) برای بە بەرەکەت. (هَذَا) ئەوەی باسمان کرد (الَّذِي يُقْضَى بِهِ وَيُحْكَمُ) هەر ئەوەیە کە بڕیاری پێ دەدرێ‌و کاری پێ دەکرێ (فِي الكُلِّ مِنْ طَبَقَتَيْنِ مِنْهُمُ) لە گشت دوو چینی منداڵەکانی کوڕی مردووەکەو بەرەو خوارتر، واتە: ئەگەر منداڵەکانی کوڕی کوڕی مردووەکە، لەگەڵ منداڵەکانی کوڕی مردووەکە دابن، ئەوە وەکو منداڵەکانی کوڕەکەنە لەگەڵ منداڵەکانی خودی مردووەکە...ئیتر هەر بەو شێوەیە پلەی بەرەو خوارتر وەك منداڵەکانی کوڕی مردووەکە دابنێ‌و، پلەی سەرەوەتریش وەك منداڵەکانی خودی مردووەکە دابنێ...هتد.

## ﴿هَذَا بَيَانُ إِرْثِ الأُصُولِ: ئەمە ڕوونکردنەوەی میراتی باوك‌و دایك‌و باپیرەو داپیرەیە﴾

بزانە: باوکی مردووەکە لە میراتگرتندا سێ حاڵەتی هەیە، **حاڵەتی یەکەم:** (يَرِثُ بِالفَرْضِ فَقَطْ أَبٌ) باوك تەنها بە خاوەن بەشی شەشێکی میراتەکە دەگرێ (إِذَا كَانَ مَعَ ابْنِ مَنْ بِلَحْدٍ نُبِذَا) هەر کاتێك لەگەڵ کوڕی مردووەکە، یان کوڕی کوڕی مردووەکە، یان بەرەو خوارتر دابێ -کە مردووەکە فڕێ دراوەتە ناو گۆڕ- جیاوازی نیە لەو منداڵانەدا: مێینە هەبێ، یان نەبێ. **حاڵەتی دووەم:** (كَذَا بِتَعْصِيبٍ فَقَطْ) هەروەها تەنها بە میراتگرایەتی پشتێ پاشماوەی میراتەکە دەگرێ (إِنْ عُدِمَا لِلْمَيْتِ فَرْعٌ وَارِثٌ) ئەگەر مردووەکە: نە کوڕو کیژی خۆی‌و، نە کوڕو کیژی کوڕی‌و، نە بەرەو خوارتریش نەبێ. **حاڵەتی سێیەم:** (وَبِهِمَا) هەم بە خاوەن بەشی‌و هەم بە میراتگرایەتی پشتێ میرات دەگرێ (مَعَ ابْنَةٍ) ئەگەر کیژێکی مردووەکە، یان زیاتری لەگەڵدا بێ (أَوْ إِبْنَةِ ابْنٍ) یان کیژە کوڕێك، یان زیاتر، یان بەرەو خوارتری لەگەڵدا بێ، بەو مەرجەی لەو منداڵانەدا

تَــرِثُ مَــعْ أَحَــدِ زَوْجَيْـــــنِ وَأَبْ ١٤٦ ثُلُثَ مَا يَبْقَـــى، وَمِــنْ أَجْـلِ الأَدَبْ
بِـــهِ يُعَـــبِّرُونَ عَمَّـــا يُدْفَـــعُ ١٤٧ لِـلأُمِّ وَهُـــوَ سُـــدُسٌ أَوْ رُبُـــعُ

---

هیچ نێرینەیەك نەبێ، کەوابوو: شەشێکی میراتەکـە بـە خـاوەن بەشـی بۆ باوکەکەیـەو هـەم لـە پـاش بەشـەکەی بـاوكو کیژەکــە، یـان کیـژە کوڕەکـە پاشماوەکـەش بـە میراتگرایەتی پشتێ هەر بۆ باوکەکەیە، بە بەڵگەی حەدیسەی ﴿فَمَا بَقِيَ فَلأَوْلَى رَجُـلٍ ذَكَرٍ﴾ی ڕابردوو، واتە: ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ نزیکترین میراتگری نێرینەیە.

## ﴿مەسەلەکانی (اَلْغَرّاوَيْن): دوو پڕشنگدارەکان﴾

(ولِلأُمّ) دایکی مردووەکـە سـێ حاڵـەتی هەیـە، **حاڵـەتی یەکـــەم:** (ثُلُـثٌ) سـێیەکی میراتەکەی هەیە، بەو مەرجەی: نە منداڵی مردووەکەو، نە بەرەو خوارترو، نـە ژمـارەی خوشكو برای مردووەکەی لەگەڵدا نەبێ. **حاڵــەتی دووەم:** (أَوْ سُـدْسٌ) یـان شەشـێکی میراتەکەی هەیە، ئەگەر یەکێك لەوانەی ڕابردووی لەگەڵدا بێ (عَلَى مَا قَدْ عُلِمْ) هـەروەك لە بەشە میراتەکاندا زاندرا. **حاڵەتی سێیەم:** (تَرِثُ مَعْ أَحَدِ زَوْجَيْنِ وَأَبٍ) ئەگەر لەگـەڵ مێردو باوکی مردووەکە، یان لەگەڵ ژنو باوکی مردووەکەدا بێ، ئەو کاتە بەشە میراتی دایکەکە (ثُلُثُ مَا يَبْقَى) سێیەکی ئەو پاشماوەیەیە: کە لە پاش بەشـی مێردەکـە، یـان ژنەکـە دەمێنێتـەوە –نـەك سـێیەکی هـەموو میراتەکــە– بـە (إجمـاع)ی (صَحابـة)ی پێغەمبەر ﷺ چونکە هەر نێرو مێیەك لە یـەك پلـەدا بـن، ئـەوە نێرینەکـە دوو هـەندی مێیینەکە دەگرێ، بەڵام (وَمِنْ أَجْلِ الأَدَبِ) لەبەر خاتری ڕێز لێنان لە قورئانی پیرۆز کە بە (ثُلُث) سێیەك ناوی ئەو بەشەی هێناوە (بِهِ يُعَبِّرُونَ عَمَّا يُدْفَعُ لِلأُمِّ) هەر بە (ثُلُـثُ مَـا يَبْقَى) سێیەکی پاشماوەکە ناوی ئەو بەشە دێنن: کە دەدرێتە دایکەکە (وَهُوَ سُدُسٌ أَوْ رُبُعُ) بەڵام لە ڕاستیدا بەشی دایکەکـە لـێرەدا: یـان شەشـێکە، یـان چوارێکـە. **ئینجـا بزانــە:** ئـەم دوو مەسـەلەیە پێیـان دەگوتـرێ: (الْغَرَّاوَيْـن) چونکـە وەك ئەسـتێرەی پڕشنگدار بەناوبانگن، هەم پێیان دەگوتـرێ: (العُمَرِيَّتَيْن) چونکـە ئیمـامی (عمـر) ئـەو بڕیارەی داوە.

**مەسەلەی یەکەم:** مێردو دایكو بـاوك، بنچینەکـەی لـە دووانـە، نیـوەی بـۆ مێردەکـەو، نیوەکەی تریش بەسەر دایكو باوکدا بەش ناکرێ، کەمترین ژمارە: کە نیوەو سـێیەکی پاشماوەکەی هەبێ: ژمارە شەشە، کەوابوو: یەکسەر دەڵێین: بنچینـەی مەسـەلەکە لـە شەشە، سێ بۆ مێردەکەیەو، سێیەکی پاشماوەکەش –کە یەکە– بۆ دایکەکەیـەو، دوو بەش بۆ باوکەکەیە، بەم شێوەیە:

ثُـمَّ لِجَـدٍّ كُـلُّ حُكْـمٍ يُنْمَـى ١٤٨ لِـلأَبِ، لَكِـنْ لاَ يَـرُدُّ الأُمَّـا
لِثُلُثِ البَـاقِي، كَـذَا لَـمْ يَحْجُـبِ ١٤٩ فَرْعَـا سِـوَى أُمٍّ، وَلاَ أُمَّ أَبِ

---

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر | ـــــــ | مێرد، | دایك، | باوك |
| ١ × بەشە میرات | ـــــــ | نیوە، | سێیەکی پاشماوە، | پشتێیە |
| ÷ ٦ | ـــــــ | ٣ + | ١ + | ٢ = ٦ |

**مەسـەلەی دووەم:** ژن‌و دایك‌و باوك، بنچینەکـەی لـە چـوارە -کـە بەشـی ژنەکـەی لێ دەردەچێ- چوارێکی بۆ ژنەکەو، سێیەکی پاشماوەکەش -کـە یەکـە- بـۆ دایکەکـەو، دووەکەش بۆ باوکەکە، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٤، میراتگر | ـــــــ | ژن، | دایك، | باوك |
| ١ × بەشە میرات | ـــــــ | چوارێك، | سێیەکی پاشماوە، | پشتێیە |
| ÷ ٤ | ـــــــ | ١ + | ١ + | ٢ = ٤ |

(ثُمَّ) ئینجا ئەگەر باوك نەمابێ، ئەوە (لِجَدّ كُلُّ حُكْمٍ يُنْمَى لِـلأَبِ) باپـیرە، واتـە: بـاوکی باوك‌و بە سەرەوەتر، گشت ئەو بڕیارانەی بۆ هەنە: کە بۆ باوك هەبوون (لَكِنْ) بەڵام لـە سێ مەسەلەدا باوك‌و باپیرە لێك جیانـە، **یەکـەم:** (لاَ يَـرُدُّ الأُمَّـا لِثُلُثِ البَـاقِي) لـە دوو مەسـەلەکەی (الْغَرّاوَيْـن)دا باپـیرە دایکـی مردووەکـە ناگەڕێنێتـەوە بـۆ سـێیەکی پاشماوەکە، بەڵکو ئەگەر باوکی مردووەکە نەمابێ دایکـی مردووەکـە لەگـەڵ باپـیرەدا سێیەکی هەموو میراتەکە دەگرێ، چونکە پلەیـەك لـە باپـیرە نزیکـترە، بـەڵام لـەو دوو مەسەلەیەدا باوکی مردووەکە دایکی مردووەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ سێیەکی پاشماوەکە، هەروەك ڕابرا. **دووەم:** (كَذَا لَمْ يَحْجُبِ فَرْعَا سِوَى أُمّ) باپـیرە -جگـە لـە خوشـك‌و بـرای تەنها لە دایکی- هیچ خوشك‌و برایەکی تـری مردووەکـە بـێ بـەش ناکـا، بـەڵکو ئەگـەر خوشك‌و برایەکان لە دایکی‌و باوکی بن، یان تەنـها لـە بـاوکی بـن، باپـیرە هاوبەشـییان لەگەڵ دەکا، بەڵام بـاوکی مردووەکـە گشـتیان بـێ بـەش دەکـا. **سـێیەم:** (وَلاَ أُمَّ أَبٍ) باپیرە دایکی بـاوکی مردووەکـە بـێ بـەش ناکـا، چونکـە ژنـی خۆیـەتی، بـەڵام بـاوکی مردووەکە دایکی خۆی بێ بەش دەکا، چونکە بەویەوە گەیشتۆتە مردووەکە.

**پاشکۆ: بزانە:** یەك داپیرە شەشێکی میراتی هەیـەو، زیـاتریش لـە یـەك داپـیرە تـەنها شەشێکی میراتیان هەیەو لە نێوان خۆیـاندا بـە یەکسـانی بـەش دەکـەن: وەك دایکـی دایکـی بـاوك‌و، دایکـی باپـیرەو، دایکی دایکی دایك، هـەروەك لـە بەشـە میراتـەکاندا بەڵگـەمان هێنـاوە، **ئینجـا بزانـە:** بـەم (قـاعدة)یە داپیرەکـان مـیرات دەگـرن: هـەر داپیرەیەك بەپوختەی مێینەکان، یان بە پوختەی نێرینـەکان بگاتـە مردووەکـە ئـەوە

هَذا بَيَانُ إرْثِ الْحَوَاشِي

وَوَلَـــدٌ لِلأَبَوَيْـــــنِ مُطْلَقـــــاً ١٥٠ كَوَلَـدٍ فِـي كُـلِّ مَـا قَـدْ سَـبَقَا
كَوَلَـــدٍ لأَبَـــوَيْ ذِي التَّرِكَـــةْ ١٥١ فَـرْعُ أَبٍ فِيمَـا سِـوَى الْمُشَـرَّكَةْ
زَوْجٌ وَأُمٌّ وَلَـــــــدَا أُمٍّ أَخُ ١٥٢ لأَبَوَيْـــنِ فَيُشَـــارِكُ الأَخُ

---

میرات دەگرێ: وەك دایكی دایكی دایك، یان دایكی دایكی باوك، هەم هەر داپیرەیەك بە پوختەی مێیینەكان بگاتە نێرینەكان: وەك دایكی دایكی باوك، ئەویش میرات دەگرێ، بەڵام هەر داپیرەیەك بە نێرینەیەكی نێوان دوو مێیینە بگاتە مردووەكە: وەك دایكی باوكی دایك، ئەوە میرات ناگرێ، **ئینجا بزانە:** لەلایەنی دایكەوە تەنها یەك داپیرە میرات دەگرێ بە بەردەوامی، هەروەك لە (تحفه)و (مغنی)دا ناوەڕۆكی ئەم پاشكۆیە ڕوون كراوەتەوە.

**﴿هَذا بَيَانُ إرْثِ الْحَوَاشِي: ئەمە ڕوونكردنەوەی میراتی خوشكو براو، مامە﴾**

(وَوَلَدٌ لِلأَبَوَيْنِ مُطْلَقاً) خوشكو برای لە دایكیو باوكی –ئەگەر خوشكو برای تەنها لە باوكییان لەگەڵدا نەبێ– ئەوە (كَوَلَدٍ فِـي كُلِّ مَا قَدْ سَبَقَا) وەكو منداڵەكانی خودی مردووەكە میرات دەگرن: لە گشت ئەو حاڵەتانەی ڕابران، واتە: برایەكو زیاتریش لە برایەك گشت میراتەكە، یان پاشماوەی میراتەكە دەگرێو، تەنها خوشكێك نیوەی میراتەكە دەگرێو، دوو خوشكو زیاتر دوو سێیەكی میراتەكە دەگرن، هەروەك لە بەشە میراتەكاندا ڕابرا، بەڵام ئەگەر خوشكو برا وێكڕا كۆبوونەوە، ئەوە هەر برایەك دوو هەندی خوشكێك دەگرێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالاً وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ ئەگەر میراتگرەكان خوشكو برا وێكڕا بوون، ئەوە نێرینە وەك بەشی دوو مێیینەی هەیە.

**﴿مەسەلەكەی (الْمُشَرَّكَة): هاوبەشكراو﴾**

(كَوَلَدٍ لأَبَوَيْ ذِي التَّرِكَةْ) وەك خوشكو برای لە دایكیو باوكی مردووەكەیە (فَرْعُ أَبٍ) خوشكو برای تەنها لە باوكی –ئەگەر خوشكو برای لە دایكیو باوكییان لەگەڵدا نەبێ– ئەوانیش بەو شێوەی ڕابردوو میرات دەگرن، بە (إجماع)ی زانایان (فِيمَا سِوَى الْمُشَرَّكَةْ) لە حاڵەتەكانی جگە لە مەسەلەكەی (المُشَرَّكَة): هاوبەشكراو، واتە: لەوێدا لێك جیانە، ئەمەش مەسەلەیەكە: (زَوْجٌ وَأُمٌّ وَلَدَا أُمٍّ أَخٌ لأَبَوَيْنِ) مێردو دایكو دوو خوشك، یان دوو برای تەنها لە دایكیو برایەكی لە دایكیو باوكی. بنچینەی مەسەلەكە

له شەشە –کە شەشێکی دایکی لێ دەردەچێ– نیوەی بۆ مێردەکەیەو، شەشێکی بۆ دایکەکەیەو، سێیەکی بۆ خوشك‌و برایەکانی تەنها لە دایکی‌یە، جا ئەو بەشانە گشت میراتەکە دادەگرنەوەو هیچ بۆ برای لە دایکی‌و باوکی نامێنێتەوە، چونکە (عَصَبَة) میراتگری پشتێیەو (قیاس) ئەوهایە: بە هۆی ئەو داگرتنەوەیە بێ بەش ببێ، بەڵام لێرەدا خزمایەتی باوکی –دەرهەق برای لە دایکی‌و باوکی– هەڵدەوەشێندرێتەوەو، تەنها خزمایەتی دایکی ڕەچاو دەکرێ، کەوابوو: (فَيُشارِكُ الأخُ وَلَدَى الأُمِّ) برایەکەی لە دایکی‌و باوکی –بە خزمایەتی دایکی– دەبێتە هاوبەشی خوشك‌و برایەکانی تەنها لە دایکی لەو سێیەکەداو، بە یەکسانی لە نێوان خۆیاندا بەشی دەکەن، چونکە گشتیان منداڵی یەك دایکن، بەڵام باوکیان جیایە، –واتە: دایکەکەیان لای کەمی دوو مێردی کردوون– جا لەبەر ئەوەی سێیەکەکە دووەو، بەسەر هەرسێك منداڵەکاندا بەش ناکرێ، ژمارەی منداڵەکان –کە سێیە– لە بنچینەی مەسەلەکە دەدەین –کە شەشە–و، لە هەژدە ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

٦، میراتگر ـــــــ مێرد، دایك، دووبرای لە دایکی، برایەکی لە دایکی‌و باوکی<br>
١ × بەشە میرات ـــــ نیوە، شەشێك، سێیەك، پشتێیە<br>
٦ ÷ ـــــــــ ٣ + ١ + ٢ + بێ بەش = ٦<br>
٣ × ـــــــ ساغکردنەوە بە سێ هاوبەش<br>
١٨ ÷ ـــــــ ٩ + ٣ + ٦ بۆ هەر سێکیان = ١٨

**ئینجا بزانە:** بەم مەسەلەیە دەگوترێ: (المُشَرَّكَة)، چونکە برایەکە کراوەتە **هاوبەشی** خوشك‌و برایەکانی تەنها لە دایکی، هەم پێی دەگوترێ: (الحِمَارِيَّة) چونکە کە ئیمامی (عمر) ﷺ ویستی برایەکانی لە دایکی‌و باوکی بێ بەش بکا، گوتیان وا دابنێ: باوکمان گوێدرێژێك بوو، خۆ گشتمان منداڵی یەك دایکین؟ هەم بە (الحَجَرِيَّة)ش ناودەبرێ، چونکە لە (رواية)ێکدا گوتیان وا دابنێ: باوکمان بەردێك بووو فڕێماندا ناو دەریا، خۆ گشتمان منداڵی یەك دایکین؟ جا ئیمامی (عمر) ﷺ قسەکەی پێ جوان بووو بە خزمایەتی دایکی کردنیە هاوبەش، کەوابوو: (وَلَوْ كَانَ لأَبٍ) ئەگەر برایەکە تەنها لە باوکی بایە، ئەوە (لأَوْجَبُوا حِرْمَانَهُ مِنَ النَّشَبْ) زانایان واجبیان دەکرد: لە میراتەکە بێ بەش ببێ، چونکە (عَصَبَة)یەو هیچی بۆ نەماوەتەوەو، دایکیشی جیایەو خزمایەتی دایکی‌ی نیە هاوبەشی‌ی پێ بکا، بەڵکو ئەگەر خوشکێکی خۆی، یان زیاتریشی لەگەڵدا بێ، ئەوە خوشکەکانیش بە هۆی ئەویەوە بێ بەش دەبن، چونکە دەیانکاتە (عَصَبَة)، بۆیێ بەو برایە دەگوترێ: (الأخُ المَشْؤُوم) برای بەدیۆم.

**ئینجا بزانە:** ئەگەر لەو مەسەلەیەدا: خوشكو برایەكانی تەنها لە دایكی لە دووان زیاتر بوون‌و، برای لە دایكی‌و باوكیش: دوو، یان زیاتر بوون، یان خوشكی لە دایكی‌و باوكییان لەگەڵدا بوو، یان لە جیاتی دایكەكە: داپیرەیەك هەبوو، ئەوە لەو حاڵەتانەدا هیچ لە هاوبەشیەكە ناگۆڕێ‌و، هیچ جیاوازییش لە نێوان خوشك‌و برایەكانی لە دایكی‌و باوكی‌دا ناكرێ‌و گشتیان بە یەكسانی دەبنە هاوبەشی خوشك‌و برایەكانی تەنها لە دایكی، بەڵام وا دەبێ ساغكردنەوەی مەسەلەكە دەگۆڕێ، هەروەها ئەگەر لەو مەسەلەیەدا لە جیاتی برای لە دایكی‌و باوكی: خوشكێك هەبوو، ئەوە نیوەی میراتەكەی هەیەو، مەسەلەكەش (عَوْل) دەكرێ بۆ نۆ، وە ئەگەر دوو خوشك، یان زیاتر بوون ئەو كاتە دوو سێیەكیان هەیەو، مەسەلەكەش (عَوْل) دەكرێ بۆ دە، واتە: لە هەردوو حاڵەتدا مەسەلەكە دەگۆڕێ‌و هاوبەشی ناكرێ‌و، جیاوازی خوشكی لە دایكی‌و باوكی‌و تەنها لە باوكیش نیە، هەروەك لە (تحفە)و (مغنی)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَحَيْثُمَا يَجْتَمِعُ الصِّنْفَانِ) هەر كاتێك هەردوو چینەكان، واتە: خوشك‌و برایەكانی لە دایكی‌و باوكی لەگەڵ خوشك‌و برایەكانی تەنها لە باوكی وێكڕا كۆبوونەوە، ئەوە (كَانَا كَفَرْعِ ابْنٍ وَفَرْعِ الفَانِي) وەكو كۆبوونەوەی منداڵەكانی كوڕی مردووەكەو منداڵەكانی خودی مردووەكەیە وێكڕا، واتە: سێ حاڵەتیان هەیە.

**حاڵەتی یەكەم:** ئەگەر برایەكی لە دایكی‌و باوكی، یان زیاتر هەبوو: بە تەنها، یان لەگەڵ خوشكی لە دایكی‌و باوكی، ئەوە گشت خوشك‌و برایەكانی تەنها لە باوكی بێ بەش دەكا، بە (إجماع)ی زانایان.

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر تەنها خوشكێكی لە دایكی‌و باوكی هەبوو، ئەوە نیوەی میراتەكە بۆ ئەو خوشكەیەو، پاشماوەكەش: بۆ خوشك‌و برایەكانی تەنها لە باوكی‌یە، هەر برایەك دوو هەندی خوشكێك دەگرێ، جا ئەگەر خوشكی تەنها لە باوكی نەبوو، ئەوە پاشماوەكە گشتی بۆ برایەكەیە، بەڵام ئەگەر برای تەنها لە باوكییان لەگەڵ نەبوو، ئەوە شەشێك -تەواوكەری دوو سێیەك- بۆ خوشكی لە باوكی‌یە، جا ئەگەر لە خوشكێك زیاتر بوون، ئەوە گشتیان لەو شەشێكەدا هاوبەشن.

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر تەنها دوو خوشكی لە دایكی‌و باوكی، یان زیاتر هەبوون، واتە: برای خۆیان لەگەڵدا نەبوو، ئەوە دوو سێیەكی میراتەكە بۆ ئەوانەو، پاشماوەكەش بۆ

لَكِنَّ الأُخْتَ لَمْ يُعَصِّبْهَا سِوَى ١٥٥ مَنْ مَعَهَا فِي رُتْبَةٍ قَدِ اسْتَوَى
وَبِنْتُ الابْنِ حَيْثُمَا صَاحَبَهَا ١٥٦ مُسَاوٍ أَوْ أَسْفَلُ قَدْ عَصَّبَهَا
وَالأُخْتُ إِنْ كَانَتْ لأُمٍّ وَأَبِ ١٥٧ بِالأَخِ فَرْعِ الأَبِ لَمْ تُعَصَّبِ

---

خوشك‌و برایه‌كانی ته‌نها له‌ باوكی‌یه‌: هه‌ر برایه‌ك دوو هه‌ندی خوشكێك ده‌گرێ، جا ئه‌گه‌ر خوشك نه‌بوو، ئه‌وه‌ پاشماوه‌كه‌ گشتی بۆ برایه‌كه‌یه‌، به‌ڵام ئه‌گه‌ر برای ته‌نها له‌ باوكی نه‌بوو، ئه‌وه‌ به‌ هۆی دوو خوشكی له‌ دایكی‌و باوكی خوشكه‌كانی ته‌نها له‌ باوكی بێ به‌ش ده‌بن.

(لَكِنَّ) به‌ڵام منداڵه‌كانی كوڕی مردووه‌كه‌و خوشك‌وبرایه‌كان له‌وه‌دا جیاوازن: (الأُخْتَ لَمْ يُعَصِّبْهَا) خوشكی مردووه‌كه‌ هیچ كه‌سێك نایكاته‌ (عَصَبَة) میراتگری پشتێ (سِوَى مَنْ مَعهَا فِي رُتْبَةٍ قَدِ اسْتَوَى) جگه‌ له‌و برایه‌ی خۆی كه‌ له‌ پله‌دا له‌گه‌ڵی یه‌كسانه‌، واته‌: خوشكی له‌ دایكی‌و باوكی به‌ برای له‌ دایكی‌و باوكی ده‌بێته‌ (عَصَبَة)و، هه‌م خوشكی ته‌نها له‌ باوكیش به‌ برای ته‌نها له‌ باوكی ده‌بێته‌ (عَصَبَة)، به‌ڵام (وَبِنْتُ الابْنِ) كیژه‌ كوڕی مردووه‌كه‌ (حَيْثُمَا صَاحَبَهَا مُسَاوٍ أَوْ أَسْفَلُ) هه‌ر كاتێك نێرینه‌یه‌كی له‌ پله‌ی خۆی، یان به‌ره‌و خوارتری له‌گه‌ڵدا بێ، ئه‌وه‌ (قَدْ عَصَّبَهَا) نێرینه‌كه‌ ده‌یكرده‌ (عَصَبَة) میراتگری پشتێ‌و، پێی ده‌گوترا (الأخ المُبارَك) هه‌روه‌ك ڕابرا.

(وَالأُخْتُ إِنْ كَانَتْ لأُمّ وَأَبِ) خوشك ئه‌گه‌ر له‌ دایكی‌و باوكی بێ (بِالأخِ فَرْعِ الأَبِ لَمْ تُعَصَّبِ) به‌ برای ته‌نها له‌ باوكی نابێته‌ (عَصَبَة)، به‌ڵكو خوشكه‌كه‌ به‌شه‌ دیاركراوه‌كه‌ی خۆی ده‌گرێ‌و، پاشماوه‌كه‌ش -ئه‌گه‌ر ماوه‌- بۆ برایه‌كه‌یه‌، هه‌روه‌ك له‌ حاڵه‌تی ڕابردوودا ڕوون كراوه‌. هه‌روه‌ها هیچ خوشكێكی مردووه‌كه‌ش به‌هۆی كوڕه‌ برای خۆی، یان كوڕه‌ مامی خۆی نابێته‌ (عَصَبَة)، بۆ وێنه‌: ئه‌گه‌ر مردووه‌كه‌: دوو خوشكی له‌ دایكی‌و باوكی‌و خوشكێكی ته‌نها له‌ باوكی‌و كوڕه‌ برایه‌كی له‌پاش به‌جێمان، ئه‌وه‌ دوو سێیه‌كی میراته‌كه‌ بۆ دوو خوشكه‌كانه‌و، پاشماوه‌كه‌ش گشتی بۆ كوڕه‌ برایه‌كه‌یه‌و، خوشكه‌ له‌ باوكیه‌كه‌ش به‌و دوو خوشكانه‌ بێ به‌ش ده‌بێ‌و به‌و كوڕه‌برایه‌ نابێته‌ (عَصَبَة)، به‌ڵام ئه‌گه‌ر هه‌ر له‌و مه‌سه‌له‌یه‌دا برایه‌كی له‌ باوكی هه‌بێ، ئه‌وه‌ خوشكه‌كه‌ی خۆی ده‌كاته‌ (عَصَبَة)و، پاشماوه‌كه‌ش بۆ هه‌ردووكیانه‌، بۆیێ به‌م برایه‌ش ده‌گوترێ: (الأخ المبارَك) برای به‌ به‌ره‌كه‌ت، هه‌روه‌ك له‌ (تحفه‌)و (مغنی)دا ڕوون كراوه‌ته‌وه‌، كه‌وابوو: كوڕه‌ برایه‌كه‌ش به‌و برایه‌ بێ به‌ش ده‌بێ، هه‌روه‌ك ڕابرا.

عَصبَـةٌ أُخْـــتٌ لأَصْلَيْـــنِ أَوَ أَبْ ١٥٨ مَعَ إِبْنَـــةٍ أَوِ ابْنَـةِ ابْـنٍ قَــدْ ذَهَــبْ
فَسَـــاقِطٌ فَـــرْعُ أَبٍ بِـــأُخْتٍ ١٥٩ لأَبَوَيْـنِ اجْتَمَعَـتْ مَـــعْ بِنْـــتِ
أَوْ ابْنَـةِ ابْـنٍ لِحَدِيـثٍ صَـحَّ بِــهِ ١٦٠ وَابْـــنُ أَخٍ لِغَـــيْرِ أُمٍّ كَأَبِـــهِ

---

﴿ئاگاداری﴾ خوشـكێكی تەنها لـە دایكی، یـان برایـەكی تەنـها لـە دایكی شەشێكی میراتەكەی هەیەو، دوو، یان زیاتریش لە خوشكو برای تەنها لە دایكی سێیەكیان هەیە، جیاوازی نێرو مێیەكانیان نیە لەو سێیەكەدا، واتـە: بـە یەكسانی بەسـەریان دابـەش دەكرێ بە (إجماع)ی زانایان، هەروەك لـە بەشـە میراتـەكاندا ڕابـرا، چونكـە ئەوانـە بـە خزمایەتی ڕەحمـێ -كـە لایـەنی دایكـە- مـیرات دەگـرن، نـەك بـە خزمایـەتی پشـتێ، كەواتە: ئەگەر خوشكو برای لە دایكیو باوكی، یان تەنها لە باوكییان لەگەڵدا بێ، هیچ بەشە میراتەكانیان ناگۆڕێ، **بۆ وێنە:** ئەگەر برایەكی لە دایكیو باوكیو برایـەكی تەنـها لە باوكیو برایەكی تەنها لە دایكی وێكڕا كۆبوونەوە، ئـەوە برایەكـەی تەنـها لـە دایكـی شەشێكی هەیەو، برایەكەی لە دایكیو باوكیش گشـت پاشماوەكـەی دەدرێتـێو، بـرای تەنها لە باوكیش بەم برایە بێ بەش دەبێ، هەروەها ئەگـەر هەرسێك لا خوشـك بـوون: ئەوە خوشكی لە دایكیو بـاوكی نیـوەی هەیـەو، خوشـكی تەنـها لـە بـاوكی شەشـێكی هەیەو، خوشكی تەنها لە دایكیش شەشێكی هەیە، هەروەك لە (مغنـی)دا فەرموویـەتی، واتە: ئەگەر لەو دوو مەسەلانەی ڕابردوودا دوو خوشكی تەنها لە دایكی، یـان دوو بـرای تەنها لە دایكی، یان خوشكێكو برایەكی تەنها لە دایكی هەبوون، ئـەو كاتـە سـێیەكیان هەیە بە هاوبەشی.

(عَصبَةٌ أُخْتٌ لأَصْلَيْنِ أَوْ أَبٍ) خوشكێكو زیاتر لـە خوشـكێكی لـە دایكـیو بـاوكی، یـان تەنها لە باوكی دەبێتە (عَصبَة): میراتگری پشتێ وەكو برایەكانیان، واتـە: پاشمـاوەی میراتەكە دەگرێ هەر كاتێك كۆببێتەوە: (مَعَ إِبْنَـةٍ) لەگـەڵ كیژێكـی خـودی مردووەكـە، یان زیاتر لە كیژێك (أَوِ ابْنَةِ ابْنٍ قَدْ ذَهَـبْ) یـان لەگـەڵ كیـژە كوڕێكـی مردووەكـە، یـان زیاتر لە كیژە كوڕێك، جا هەر كاتێك خوشك ببێتـە (عَصَبَـة). ئـەوە (فَسَاقِطٌ فَـرْعُ أَبٍ) خوشكو برایەكانی تەنها لە باوكی بـێ بـەش دەبـن (بِأُخْتٍ لأَبَوَيْـنِ اجْتَمَعَـتْ مَـعْ بِنْـتٍ) بەهۆی خوشكێكی لە دایكیو باوكی كە كۆببێتەوە لەگەڵ كیژی مردووەكە (أَوْ ابْنَـةِ ابنٍ) یان لەگەڵ كیژە كوڕی مردووەكە، هـەروەك بـە بـرای لـە دایكـیو باوكیشـی بـێ بـەش دەبوون. هەروەها ئەگەر خوشكی تەنها لە باوكیش لەگەڵ كیژی مردووەكە، یان لەگەڵ

لَكِــنْ إِلَــى السُّــدُسِ أُمّــاً لاَ يَــرُدّْ ١٦١ وَلَــمْ يُعَصِّــبْ أُخْتَــهُ وَمَــعَ جَــدّْ
لاَ يَــأْخُذُ الإِرْثَ وَفِــي الْمُشَــرَّكَةْ ١٦٢ يَسْــقُطُ لاَ حَــظَّ لَــهُ فِــي التَّرِكَــةْ
وَعَمُّ مَــنْ أَدْرَكَــهُ الْمَــوْتُ وَعَــمّْ ١٦٣ وَالِــدِهِ وَجَــدِّهِ لِغَــيْرِ أُمِّ

---

كیژه كوڕی مردووه‌كه بێته (عَصَبَــة)، ئـه‌ویش –وه‌كو بـرای تـه‌نها لـه بـاوكی– كـوڕه برایه‌كان‌و مامه‌كان‌و...هتد بێ به‌ش ده‌كا، هه‌روه‌ك له (حاشية البقـري)دا فه‌رموویه‌تی (لِحَديثٍ صَحَّ بِهِ) چونكـه حه‌دیسـێكی (صحيح) لـه‌باره‌ی (عَصَبَـة)یـی خوشـك هـاتووه ﴿عَنْ إبنِ مَسْعُودٍ ﷺ: قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ لِلاِبْنَةِ النِّصْفَ وَلاِبْنَةِ الإِبْنِ السُّدُسَ وَمَــا بَقِيَ لِلأُخْــتِ﴾ رواه البخـاري، پێغه‌مبـه‌ر ﷺ بڕيـاری دا: نیـوه‌ی میراته‌كـه بـۆ كیـژی مردووه‌كه بێ‌و، شه‌شێكی بۆ كیژه كوڕه‌كه‌ی بێ‌و، پاشماوه‌كه‌یشی بۆ خوشكه‌كه بێ.
جا بنچینه‌ی ئه‌م مه‌سه‌له‌یه له شه‌شه –كه به‌شی كیژه كوڕه‌كه‌ی لێ ده‌رده‌چێ– به‌م شێوه‌یه:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر ــــــــ | كیژ، | كیژه كوڕ، | خوشك | |
| ١ × به‌شه میرات ــــ | نیوه، | شه‌شێك، | پشتێیه | |
| ٦ ÷ ــــــــــ | ٣ + | ١ + | ٢ | = ٦ |

(وَابْنُ أَخٍ لِغَيْرِ أُمّ) كوڕه برایه‌ك كه ته‌نها له دایكی نه‌بێ، به‌ڵكو: كوڕه برای لـه دایكـی‌و باوكی بێ، یان تـه‌نها له باوكی بێ (كَأَبِهِ) هه‌ر یه‌كێك له‌وانـه وه‌كو بـاوكی خۆیـه‌تی لـه حاڵه‌تی كۆمه‌ڵی‌و ته‌نهایی‌دا، واته: كوڕه برایه‌ك‌و زیاتر له كوڕه برایه‌ك گشت میراته‌كه، یان پاشماوه‌ی میراته‌كه ده‌گرێ‌و، ئه‌گه‌ر هه‌ردوولا وێكڕا كۆبوونه‌وه، ئه‌وه كـوڕه بـرای له دایكی‌و باوكی كوڕه بـرای ته‌نـها لـه بـاوكی بـێ بـه‌ش ده‌كـا (لَكِنْ) بـه‌ڵام لـه چـوار مه‌سه‌له‌دا كوڕه برایه‌كان له باوكی خۆیان جیاوازن، **یه‌كه‌م:** كوڕه برایه‌كه (إِلَى السُّدُسِ أُمّاً لاَ يَرُدّ) دایكـی مردووه‌كـه لـه سێیه‌كه‌وه ناگه‌ڕێنێتـه‌وه بـۆ شه‌شـێك. **دووه‌م:** (وَلَـمْ يُعَصِّبْ أُخْتَهُ) كوڕه برایه‌كه خوشكی خۆی ناكاته (عَصَبَة)، چونكه كیـژه بـرا لـه (ذَوِي الأَرْحام)ه‌كانه. **سێیه‌م:** (وَمَعَ جَدّ لاَ يَأْخُذُ الإِرْثَ) كوڕه برایه‌كه له‌گـه‌ڵ باپـیره‌دا مـیرات ناگرێ، به‌ڵكو به‌هۆی باپیره بێ به‌ش ده‌بێ. **چواره‌م:** (وَفِي الْمُشَرَّكَةْ يَسْقُطُ) كوڕه برای له دایكی‌و باوكی له مه‌سه‌له‌ی (الْمُشَرَّكَة)دا بێ به‌ش ده‌بێ‌و (لاَ حَظَّ لَهُ فِي التَّرِكَةْ) هیـچ به‌شی له میراته‌كه‌دا نیه، چونكه خزمایه‌تی دایكیان نیه.
(وَعَمُّ مَنْ أَدْرَكَهُ الْمَوْتُ) مامی ئه‌و كه‌سه‌ی مردنی گه‌یوه‌تێ‌و (وَعَمُّ وَالِدِهِ) مـامی بـاوكی مردووه‌كه‌و (وَجَدِّهِ) مامی باپیره‌ی مردووه‌كه (لِغَيْرِ أُمِّ) كه هه‌ر یـه‌كێك لـه‌و سـێ مامـه

مِثْـــلُ أَخٍ لأَبَوَيْـــنِ أَوَ أَب ١٦٤ كَـذَاكَ بَـاقِي عَصَبَـاتِ النَّسَـبِ

هَذا بَيَانُ الإرْث بالوَلاَءِ

عَصَبَـةُ النَّسَـبِ حَيْـثُ تُعْـدَمُ ١٦٥ فَالْمَـالُ أَوْ فَاضِلُـهُ يُسَـلَّمُ

لِمُعْتِـقٍ، فَـإِنْ هَـوَى فِـي رَمْسِـهِ ١٦٦ أَخَـذَهُ عَصَبَـةٌ بِنَفْسِـهِ

تَرْتِيبُـهُمْ هُنَـا كَتَرْتِيبِـهِمُ ١٦٧ فَـي نَسَـبٍ لَكِـنْ هُنَـا يُقَـدَّمُ

---

تەنها لە دایكی نەبێ، بەڵكو لە دایكیو باوكی بێ، یان تەنها لە باوكی بێ، هەرسێكیان (مِثْلُ أَخٍ لأَبَوَيْنِ أَوْ أَبٍ) وەكو برای لە دایكیو باوكیو برای تەنها لە باوكی‌یە لە حاڵەتی كۆمەڵیو تەنهایی‌دا، واتە: مامێكو زیاتر لـە مـامێك گشت میراتەكـە، یان پاشمـاوەی میراتەكە دەگرێو، ئەگەر هەردوولا وێكـڕا كۆبوونـەوە، ئـەوە مـامی لـە دایكـیو بـاوكی مامی تەنها لە باوكی بێ بەش دەكا (كَذَاكَ بَاقِي عَصَبَاتِ النَّسَبِ) هەر وەهایە (قیاس)ی میراتگرەكانی تری پشتێی نـەژادی: وەك كـوڕە مامـەكانو، كـوڕە كـوڕە برایـەكانو، كوڕە كوڕە مامەكان، واتە: هەر یەكێك لەوانە بە تەنها گشت میراتەكە، یان پاشماوەكە دەگرێو، ئەوەی لە دایكیو باوكی‌یە تەنها لە باوكی‌یەكە بێ بەش دەكا، **ئینجا بزانە:** لە دوای كوڕە مامایەتی هیـچ (عَصَبَـة)یـەكی تـری نـەژادی نیـە، هـەروەك لـە (تحفـة)و (نهایة)دا فەرموویانەو، هەم لە كۆتایی (الحجب)دا ڕیزی (عَصَبَة)ەكانمان ڕوون كردەوە، والْحَمْدُ لله تَعالَى.

## ﴿هَذا بَيَانُ الإرْثِ بِالوَلاَءِ: ئەمە ڕوونكردنەوەی میراتگرتنە بەهۆی ئازاد كردنی كۆیلە﴾

(عَصَبَةُ النَّسَبِ حَيْثُ تُعْدَمُ) هەر كاتێك مـیراتگری پشتێ لـە نـەژادی مردووەكـە نـەبێ، ئەوە (فَالْمَالُ) گشت ماڵی مردووەكە (أَوْ فَاضِلُهُ) یان ئەو پاشماوەیەی لە پاش خاوەن بەشەكان دەمێنێتەوە (يُسَلَّمُ لِمُعْتِقٍ) تەسلیمی ئازاد كەرەكـەی دەكرێ -واتـە: ئەگـەر مردووەكـە كـاتی خـۆی كۆیلـە بووبـێو كەسێك ئـازادی كردبـێ- جیـاوازی نیـە ئـازاد كەرەكە: پیاو بێ، یان ئافرەت، (فَإِنْ هَوَى فِي رَمْسِه) جا ئەگەر ئازاد كەرەكـە كەوتـە گۆڕەكەی خۆی، ئەو كاتە (أَخَذَهُ عَصَبَةٌ بِنَفْسِه) ئـەوەی لـە نـەژادی ئـازاد كـەرەكە بـە خـودی خـۆی (عَصَبَـة)یـە میراتەكـە وەردەگرێ: وەكـو كـوڕو بـرا، نـەك كیـژو خوشـك (تَرْتِيبِهِمْ هُنَا) ڕیزی (عَصَبَة)ەكانی ئازاد كەرەكـە لـێرەدا (كَتَرْتِيبِـهُمُ فَـي نَسَبٍ) وەكـو

الأَخُ وَابْـنُ الأَخِ وَالجَـدُّ بَقِـي ١٦٨مُؤَخَّـراً، فَمُعْتِـقٌ لِلْمُعْتِـقِ
فَعَصَباتُـهُ بِتَرْتِيبٍ سَبَقْ ١٦٩إن اشْتَرَتْ بِنْتٌ أَباهَـا فَعَتَـقْ
وَأَعْتَـقَ الوَالِـدُ بَعْـدُ عَبْـدَا ١٧٠ثُـمَّ أَبُوهَـا بَعْـدَ ذَاكَ أَوْدَى
عَنْهَا وَعَـنْ عَصَبَـةٍ كَجَـدِّهِ ١٧١ثُـمَّ تَـوَى عَتِيقُـهُ مِـنْ بَعْـدِهِ
فَلَيْـسَ لِلْبِنْـتِ تُـرَاثُ رَقَبَـةْ ١٧٢أَعْتَقَـهَا الوَالِـدُ بَـلْ لِلْعَصَبَـةْ
هُوَ الَّـذِي عَلَـى القُضَـاةِ أَشْـكَلاَ ١٧٣وَلَـمْ تَكُـنْ تَـرِثُ أُنْثَـى بِـوَلاَ
إلاَّ عَتِيقَـهَا أَوِ الَّـذِي انْتَسَـبْ ١٧٤إلَيْـهِ إمَّـا بِـوَلاَءٍ أَوْ نَسَـبْ

---

ڕیزی (عَصَبَة)ەكانە لە نەژاددا، واتە: ئەگەر ئازاد كەرەكە نەمابێ، ئەوە كوڕی وی، ئینجا كوڕی كوڕ...هتد، (لَكِنْ هُنَا يُقَدَّمُ الأَخُ وَابْنُ الأَخِ) بەڵام لێرەدا برای ئازاد كەرەكەو، كوڕە برای ئازاد كەرەكە وەپێش باپیرەی ئازاد كەرەكە دێخرێنو (وَالجَدُّ بَقِي مُؤَخَّراً) باپیرەش بە دواخراوی دەمێنێتەوە. ئینجا ئەگەر ئازاد كەرەكەش میراتگری پشتێی لە نەژادی خۆی نەبوو، ئەو كاتە (فَمُعْتِقٌ لِلْمُعْتِـقِ) ئازاد كەری ئازاد كەرەكە میراتەكە دەگرێ (فَعَصَباتُـهُ بِتَرْتِيبٍ سَبَقْ) ئینجا (عَصَبَـة)ەكانی ئازاد كەری ئازاد كەرەكە: بەو ڕیزەی ڕابرا، ئینجا (بَيْت المَال) دەبێتە میراتگر.
(إن اشْتَرَتْ بِنْتٌ أَباهَا) ئەگەر كیژێك باوكی خۆی كۆیلە بێو بیكڕێ (فَعَتَقْ) باوكەكەش بەو كڕینە ئازاد بوو (وَأَعْتَقَ الوَالِدُ بَعْدُ عَبْدًا) ئینجا باوكەكەش لەمەو پاش كۆیلەیەكی ئازاد كرد (ثُمَّ أَبُوهَا بَعْدَ ذَاكَ أَوْدَى) ئینجا باوكەكەشی لە دوای ئازاد كردنی كۆیلەكە مرد (عَنْهَا وَعَنْ عَصَبَةٍ) كیژەكەو میراتگرێكی پشتێی لەپاش بەجێما: (كَجَدِّهِ) وەكو باپیرە، یان باوك، یان كوڕ (ثُمَّ تَوَى عَتِيقُهُ مِنْ بَعْدِهِ) ئینجا كۆیلە ئازاد كراوەكەش لە دوایی باوكەكە مردو، هیچ میراتگرێكی نەژادیی نەبوو، ئەوە (فَلَيْسَ لِلْبِنْـتِ تُـرَاثُ رَقَبَةٍ أَعْتَقَهَا الوَالِدُ) میراتی ئەو كۆیلەیە –كە باوكەكە ئازادی كردبوو– نادرێتە كیژەكەی، چونكە كیژەكە لێرەدا ئازاد كەری ئازاد كەرەكەیە (بَـلْ لِلْعَصَبَـةْ) بەڵكو میراتی كۆیلە ئازاد كراوەكە بۆ (عَصَبَـة)ەكانی باوكەكەیە، چونكە ئازاد كەری كۆیلەكە یەكەو، (عَصَبَة)ەكانی ئازاد كەریش لە ئازاد كەری ئازاد كەر لە پێشترن (هُوَ الَّذِي عَلَى القُضَـاةِ أَشْكَلاَ) ئەوە ئەو مەسەلەیە كە لە قازیەكان بووەتە موشكیلەو تێیدا بە هەڵەدا دەچنو میراتەكە دەدەنە كیژەكە. (وَلَمْ تَكُنْ تَـرِثُ أُنْثَـى بِـوَلاَءٍ) ئافرەت بەهۆی ئازاد كردن میرات لە هیچ كەسێك ناگرێ (إلاَّ عَتِيقَهَا) تەنها لە ئازاد كراوی خۆی نەبێ (أَوِ

## هَذا بَيَانُ إرْثِ الْجَدِّ مَعَ الأَخْوَة

اَلْجَـدُّ مَـعْ فَـرْعِ أَبٍ أَوْ وَلَـدِ ١٧٥ لأَبَوَيْـنِ فَـائِزٌ بِـالأَزْيَدِ
مِـنْ ثُلْـثٍ وَالقَسْـمِ عِنْـدَ فَقْـدِ ١٧٦ صَـاحِبِ فَـرْضٍ كَـأَخٍ وَجَـدِّ
قُلْتُ: هُمَا مَعَ ضِعْـفِ جَـدٍّ شَـرَعُ ١٧٧ وَدُونَ مِثْلَيْـهِ الأَخِـيرُ انْفَـعُ

---

الَّذِي انْتَسَبَ إلَيْهِ) يان لەو كەسەی دەچێتەوە لای ئازاد كراوەكە: (إمَّـا بِـوَلاَءٍ أَوْ نَسَبٍ) يان بە هۆی ئازاد كردن: وەكو ئازاد كراوی ئازاد كراوەكە، يان بە نەژاد: وەكو كوڕو بەرەو خوارتر.

### ﴿هَذا بَيَانُ إرْثِ الْجَدِّ مَعَ الإخْوَة: ئەمە ڕوونكردنەوەی میراتی باپیرەیە كە لەگەڵ خوشكو برایەكان دابێ﴾

**پێشەكی بزانە:** لە مەزهەبی ئیمامی (أبی حنيفة)دا: باپیرە خوشكو برایەكان بێ بەش دەكا، بەڵام لە هەرسێك مەزهەبەكەی تردا: بێ بەشیان ناكا، بەڵكو هاوبەشییان لەگەڵ دەكا: بەم شێوەیەی لەم باسەدا ڕوون كراوەتەوە، هەروەك لە (تحفه)و (مغنی)دا فەرموویانە، ئینجا باپیرە چۆن قازانجی بێ، ئەوها –لەگەڵ خوشكو برایەكاندا– میرات دەگرێ، جا میراتگرتنەكەیشی چوار حاڵەتی هەیە، گشتیان لە قازانجی خۆیەتی:

**حاڵەتی یەكەمو دووەم:** (اَلْجَدُّ مَعْ فَرْعِ أَبٍ أَوْ وَلَدِ لأَبَوَيْـنِ) باپیرە، یان باوكی باپیرە ئەگەر لەگەڵ خوشكو برایەكانی مردووەكەدا بێ: جا لە دایكیو باوكی بن، یان تەنها لە باوكی بن، ئەوە (فَـائِزٌ بِـالأَزْيَدِ مِنْ ثُلُثٍ وَالقَسْمِ) باپیرە بەشە زۆرترەكەی هەیە: لە سێیەكی گشت میراتەكەو لە هاوبەشی كردن لەگەڵیان وەكو برایەك، كەواتە: ئەگەر تەنها خوشكی لەگەڵدا بن، ئەوە –وەكو برایەك– دوو هەندی بەشی خوشكێك دەگرێ، ئینجا ئەو دوو حاڵەتە (عِنْدَ فَقْدِ صَاحِبِ فَرْضٍ) لەو كاتەیە: كە هیچ میراتگرێكی خاوەن بەش لەگەڵ باپیرەو برایەكاندا نەبێ: (كَأَخٍ وَجَدِّ) وەكو برایەكو باپیرە: میراتەكە بۆ هەردووكیانە بە نیوەیی.

(قُلْتُ) بۆ زانینی بەشە بە سوودترەكە، من دەڵێم: (هُمَا مَعَ ضِعْفِ جَدٍّ شَرَعُ) ئەگەر ژمارەی خوشكو برایەكان دوو هەندی باپیرە بوو: ئەوە هاوبەشی كردنو سێیەكی میراتەكە بۆ باپیرە یەكسانن: وەك دوو برا، یان چوار خوشك، یان برایەكو دوو خوشك.

(وَدُونَ مِثْلَيْهِ الأَخِيرُ اَنْفَعُ) وە ئەگەر ژمارەكەیان لە دوو هەندی باپیرە كەمتر بوو: ئەوە هاوبەشی كردن بۆ باپیرە بەسوودترە: وەك برایەك، یان خوشكێك، یان دوو خوشك،

وَمَــعَ فَــوْقَ ضِعْفِــــهِ فَـــالْأَكْثَرُ ١٧٨ ثُلْــثٌ وَمَـــا صُــــوَرُهُ تَنْحَصِــــرُ
أَوْ فَـــائِزٌ مِـــنْ قِسْــــمَةٍ وَسُـــــدُسٍ ١٧٩ وَثُلُــثِ الْبَــاقِي بِــأَخْذِ الْأَنْفَــــسِ
إِنْ كَـــانَ ذُو فَرِيضَــــــةٍ، وَسِــــتٌّ ١٨٠ هُنَــا ذَوَاتُ الفَــرْضِ وَهِــيَ بِنْــــتُ
وَالْأُمُّ وَالبِنْــــتُ الَّتِـــى لِنَجْـــــلِ ١٨١ وَجَــدَّةٌ مَــــعْ زَوْجَـــةٍ وَبَعْـــلِ
فَفِـــى ابْنَتَيْـــنِ وَأَخٍ وَعَــــــرِسِ ١٨٢ وَجَـــدٍّ الأَجْــوَدُ أَخْــذُ السُّــــدُسِ

---

یان سێ خوشك، یان خوشـكێكو برایـەك. (وَمَـعَ فَـوْقِ ضِعْفِـهِ فَـالْأَكْثَرُ ثُلُـثٌ) وە ئەگـەر ژمارەكەیان لە دوو هەندی باپیرە زیاتر بوو: ئەوە سێیەكی میراتەكە بۆ باپیرە زۆرتـرە لە هاوبەشی كردن: وەك سێ براو زیاتر، یان پێنـج خوشـكو زیـاتر، یـان برایـەكو سـێ خوشـك، یـان دوو بـراو خوشـكێك...هتـد، چونكـە (وَمَـا صُـوَرُهُ تَنْحَصِـرُ) لەبـەر زۆری وێنەكانی سەرژمێر ناكرێن، ئینجا هەر كاتێك باپیرە سێیەكی میراتەكـەی گـرت، ئـەوە پاشماوەكەی بۆ خوشـكو برایەكانـە بـە میراتگرایـەتی پشـتێ، واتـە: هـەر برایـەك دوو هەندی بەشی خوشكێكی هەیە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

**حاڵەتی سێیەمو چوارەم:** (أَوْ فَائِزٌ مِنْ قِسْمَةٍ وَسُدُسٍ وَثُلُثِ البَـاقِي بِـأَخْذِ الْأَنْفَـسِ) یـان باپیرە بەشە زۆرترەكە دەگرێ: لە هاوبەشی كردنەكـەی ڕابـردووو لـە شەشـێكی گشـت میراتەكەو لە سێیەكی پاشماوەكە (إِنْ كَانَ ذُو فَرِيضَةٍ) ئەگەر لەگەڵ باپـیرەو خوشـكو برایەكاندا میراتگری خاوەن بەش هەبێ (وَسِتٌّ هُنَا ذَوَاتُ الفَرْضِ) خـاوەن بەشـەكان لـە باسی باپیرەدا شەش كەسن (وَهِيَ بِنْتٌ) كیژ (وَالأُمُّ) دایكو (وَالبِنْتُ الَّتِي لِنَجْـلِ) كیـژە كوڕو (وَجَدَّةٌ) داپیرەو (مَعْ زَوْجَةٍ) ژنو (وَبَعْلٍ) مێرد.

كەوابوو: (فَفِي ابْنَتَيْنِ وَأَخٍ وَعَرِسٍ وَجَدّ) لە مەسەلەی دوو كیژو برایەكو ژنێكو باپیرەدا: (الأَجْـوَدُ أَخْـذُ السُّـدُسِ) باشـتر بـۆ باپــیرە وەرگرتــنی شەشـێكە، چونكـە بنچینـەی مەسەلەكەیان لە بیسـتو چـوارە: بـە لێدانـی سـێ لـە هەشـت –كـە بەشـی كیژەكـانو ژنەكەیان لێ دەردەچێ– دوو سێیەكی بۆ كیژەكانو، هەشتێكی بۆ ژنەكـەو، شەشـێكی بۆ باپیرەو، پاشماوەكەیشی –یەكە– بۆ برایەكە، بەم شێوەیە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٨، میراتگر ______ | دوو كیژ، | ژن، | باپیرە، | برا | |
| ٣ × بەشە میرات ______ | دوو سێیەك، | هەشتێك، | شەشێك، | پشتێیە | |
| ٢٤ ÷ ______ | ١٦ + | ٣ + | ٤ + | ١ | = ٢٤ |

وَإِنْ وَجَـــدْتَ جَـــدَّةً وَجَـــدًّا ١٨٣ مَـعَ أَخٍ فَالْقَسْـمُ صَـارَ أَجْـــدَى
أَوْ إِخْـــوَةً عَشَـــرَةً وَجَـــدًّا ١٨٤ وَجَـدَّةً فَثُلْـــثُ بَـــاقٍ أَجْـدَى
وَضَـابِطُ الأَكْـثَرِ لَيْـسَ يَخْفَـــى ١٨٥ فَـالْفَرْضُ رُبَّمَـا يَكُـــونُ نِصْفَـــا
وَقَـدْ يَكُـونُ دُونَ نِصْـفٍ فَـالْعَدَدْ ١٨٦ لإِخْـوَةٍ يَكُـونُ دُونَ ضِعْـفِ جَـدّْ

---

(وَإِنْ وَجَدْتَ جَدَّةً وَجَداً مَعَ أَخٍ) ئەگەر لە مەسەلەکەدا داپیرەیەكو باپیرە لەگـەڵ برایـەك هەبوون، ئەوە (فَالْقَسْمُ صَارَ أَجْدَى) هاوبەشـی کـردن بـۆ باپـیرە بەسـوودترە، چونکـە بنچینـەی مەسـەلەکە لەشەشـە –کـە بەشـی داپـیرەی لیٚ دەردەچـیٚ– شەشـیٚکی بـۆ داپیرەیە، بەڵام پاشماوەکە بەسەر باپیرەو برایەکەدا بەش ناکریٚ بۆیێ ژمارەکـەیان – کە دووە– لە مەسەلەکە دەدەینو لەدوانزە ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر | | داپیرە، | باپیرە، | برایەك |
| ١ × بەشە میرات | | شەشێك، | پشتێنە | |
| ٦ ÷ | | ١ | + ٥ | = ٦ |
| ٢× | ساغکردنەوە بە ٢ هاوبەش | | | |
| ١٢ ÷ | | ٢ | + ١٠ | = ١٢ |

(أَوْ إِخْوَةً عشَرَةً وَجداً وَجدَّةً) یـان ئەگـەر لـە مەسـەلەکەدا دە بـراو باپـیرەو داپیرەیـەك هەبوون، ئەوە (فَثُلْثُ بَاقٍ أَجْدَى) سێیەکی پاشماوەکە بۆ باپیرە بە سوودترە، چونکە بنچینـەی مەسـەلەکە لـە شەشـە –کـە بەشـی داپـیرەی لیٚ دەردەچـیٚ– شەشـیٚکی بـۆ داپیرەیە، بەڵام چونکە پاشماوەکە –پێنجە– سێیەکی ساغی نیە، بۆیێ سێ لە شـەش دەدەینو لە هەژدە ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر | داپیرە، | باپیرە، | ده برایەکان | |
| ١ × بەشە میرات | شەشێك، | سێیەکی پاشماوەکە، | پشتێنە | |
| ٦ ÷ | ١ | + ٥ | | = ٦ |
| × ٣ | ساغکردنەوە بە لێدەرچووی سێیەك | | | |
| ١٨ ÷ | ٣ | + ٥ | + ١٠ | = ١٨ |

(وَضابِطُ الأَكْثَرِ) ئەو (قاعدة)یەی زۆرترەکەی پـیٚ دەزانـدریٚ بـۆ باپـیرە (لَيْسَ يَخْفَـى) ناشاردرێتەوە، چونکە (فَالْفَرْضُ رُبَّمَا يَكُونُ نِصْفاً) ئەو بەشە میراتەی –لەگەڵ باپیرە– بۆ خاوەن بەشەکان دادەندریٚ وا دەبـیٚ: نیوەیـە: وەك مـێرد، یـان کیژێـك، یـان کـیژە کوڕێك هەبیٚ (وَقَدْ يَكُونُ دُونَ نِصْفٍ) هەندێك جاریش بەشـەکە لـە نیـوە کـەمترە: وەك ژن، یان دایك هەبیٚ، ئینجا لەو کاتانەشدا (فَالْعَدَدُ لإِخْوَةٍ يَكُونُ دُونَ ضِعْفِ جَدّ) ژمارەی

فَالقَسْـمُ خَـيْرٌ، أَوْ يَكُـونُ أَعْلَــى ١٨٧ مِـنْ ضِعْفِـهِ فَثُلْـثُ بَـاقٍ أَوْلَــى
أَوْ ضِعْفُـــهُ فَمُتَسَـــاوِيان ١٨٨ وَيَسْـتَوِي مَـعْ سُـدُسٍ هَـــذَان
وَقَـدْ يَكُـونُ الفَـرْضُ ثُلْثَيْـنِ فَـلاَ ١٨٩ شَكَّ إِذًا فِـي كَـوْنِ قَسْـمٍ أَفْضَـلاَ
إِنْ تَـكُ أُخْـتٌ مَعَـــهُ، وَإِلاَّ ١٩٠ فَإِنَّـــهُ بِسُـــدُسٍ تَمَلَّـــى

---

خوشك‌و برایه‌كان: ئه‌گه‌ر له دوو هه‌ندی باپیره كه‌متر بێ، ئه‌وه (فَالقَسْـمُ خَـيْرٌ) هاوبه‌شی كردن له‌گه‌ڵیان بۆ باپیره باشتره: وه‌ك باپیره‌و برایه‌ك‌و كیژێك: كیژه‌كه نیوه ده‌گرێ‌و، نیوه‌كه‌ی تریش بۆ باپیره‌و برایه‌كه‌یه به یه‌كسانی. (أَوْ يَكُونُ أَعْلَى مِنْ ضِعْفِه) یان ئه‌گه‌ر ژماره‌كه‌یان له دوو هه‌ندی باپیره زیاتر بوو، ئه‌وه (فَثُلْثُ بَاقٍ أَوْلَى) سێیه‌كی پاشماوه‌كه بۆ باپیره باشتره: وه‌ك باپیره‌و سێ براو مێرد: مه‌سه‌له‌كه له شه‌شه -به لێدانی دوو له سێ- كه به‌شی مێردو باپیره‌یان لێ ده‌رده‌چێ -سێ بۆ مێرده‌كه‌و، سێیه‌كی پاشماوه‌كه‌ش -یه‌كه- بۆ باپیره‌و، دووه‌كه‌ش بۆ برایه‌كان، ئینجا ژماره‌ی برایه‌كانیش له مه‌سه‌له‌كه ده‌ده‌ین‌و له هه‌ژده ساغ ده‌بێته‌وه (أَوْ ضِعْفُـهُ) یان ئه‌گه‌ر ژماره‌كه‌یان دوو هه‌ندی باپیره بوو، ئه‌وه (فَمُتَسَاوِيان) هاوبه‌شی‌و سێیه‌كی پاشماوه‌كه یه‌كسانن، وه‌ك باپیره‌و دوو براو ژنێك: مه‌سه‌له‌كه له چواره، چونكه ژنه‌كه چوارێك ده‌گرێ‌و سێ به‌شه‌كه‌ی تریش بۆ باپیره‌و برایه‌كان به یه‌كسانی (وَيَسْتَوِي مَعْ سُدُسٍ هَذَان) هه‌ندێ جار هاوبه‌شی‌و سێیه‌كی پاشماوه‌كه له‌گه‌ڵ شه‌شێك یه‌كسانن: وه‌ك باپیره‌و دوو براو كیژێك، بنچینه‌ی مه‌سه‌له‌كه له دووه‌و، له شه‌ش ساغ ده‌بێته‌وه به لێدانی ژماره‌ی باپیره‌و برایه‌كان له مه‌سه‌له‌كه: له هه‌رسێك حاڵه‌تدا یه‌ك بۆ باپیره‌كه‌یه.

(وَقَدْ يَكُونُ الفَرْضُ ثُلْثَيْنِ) هه‌ندێ جاریش به‌شه میراته‌كه دوو سێیه‌كه: وه‌كو دوو كیژ، یان دوو كیژه كوڕ، یان كیژێك‌و كیژه كوڕێك هه‌بێ، ئه‌وه (فَـلاَ شَكَّ إِذاً فِي كَوْنِ قَسْمٍ أَفْضَلاَ) گومان نیه هاوبه‌شی بۆ باپیره زۆرتره (إِنْ تَكُ أُخْتٌ مَعَـهُ) به‌و مه‌رجه‌ی ته‌نها خوشكێكی له‌گه‌ڵدا بێ: وه‌ك باپیره‌و خوشكێك‌و دوو كیژ، بنچینه‌ی مه‌سه‌له‌كه‌یان له سێیه -كه به‌شی كیژه‌كانی لێ ده‌رده‌چێ- به‌ڵام له نۆ ساغ ده‌بێته‌وه به لێدانی سێ -كه ژماره‌ی باپیره‌و خوشكه‌كه‌یه- له مه‌سه‌له‌كه: شه‌ش بۆ كیژه‌كان‌و، سێ بۆ باپیره‌و خوشكه‌كه. (وَإِلاَّ) به‌ڵام ئه‌گه‌ر له خوشكێك زیاتری له‌گه‌ڵدا بێ: وه‌ك برایه‌ك‌و

وَبَيْـنَ نِصْـفِ الْمَـالِ وَالثُّلْثَيْـنِ ١٩١ فَمَـعْ أَخٍ أَوْ أُخْـتٍ أَوْ أُخْتَيْـنِ
حَـازَ الْمُقَاسَـمَةَ فَـهِيَ أَنْفَـسُ ١٩٢ وَسَـهْمُهُ مَـعَ أَخَوَيْـنِ السُّـدُسُ
هَـذَا إِذَاذُو الْفَـرْضِ حَـازَ جَـدَّهُ ١٩٣ وَفَـوْقَ سُـدْسٍ قَـدْ تَبَقَّـى بَعْـدَهُ
أَمَّـا إِذَا لَـمْ يَبْـقَ عَنْـهُ فَضْـلُ ١٩٤ أَوْ بَقِـيَ السُّـدُسُ أَوْ أَقَـلُّ

---

زیاتر، بان دوو خوشكو زیاتر، ئەو كاتە (فَإِنَّهُ بِسُدُسٍ تَمَلَّى) باپیرە بە شەشێكی هەموو میراتەكە لەززەتی وەرگرتـووە، چونكـە بەسـوودترە: وەك دوو كیـژو برایـەكو باپـیرە، بنچینەی مەسەلەكەیان لە شەشە -كە بەشی باپیرەی لیٚ دەردەچیٚ- دوو سێیەكی -چوارە- بۆ كیژەكانو، شەشـێكی -یەكـە- بۆ باپـیرەو، پاشماوەكـەش -یەكـە- بۆ برایەكە.

(وَبَيْـنَ نِصْـفِ الْمَـالِ وَالثُّلْثَيْـنِ) هـەندیٚ جاریش بەشـە میراتەكـە لـە نێـوان نیـوەو دوو سێیەكە: وەك كیژێكو ژنێك -كە نیوەو هەشتێكیان هەیە- ئەو كاتە (فَمَعْ أَخٍ أَوْ أُخْتٍ أَوْ أُخْتَيْنِ) ئەگەر باپیرە لەگەڵ برایەك، یان خوشـكێك، یـان دوو خوشك دابیٚ، ئـەوە (حَـازَ الْمُقَاسَـمَةَ فَـهِيَ أَنْفَسُ) باپـیرە هاوبەشـیەكە وەردەگـریٚ چونكـە بـە سـوودترە، كەواتە: بنچینەی مەسەلەكەیان لە هەشتە -كە بەشی ژنەكەی لیٚ دەردەچـیٚ- نیـوەی -چوارە- بۆ كیژەكەو، هەشـتێكی -یەكـە- بـۆ ژنەكـەو، پاشماوەكـەیش بۆ باپـیرەو خوشك، یان برا. بـەڵام (وَسَـهْمُهُ مَـعَ أَخَوَيْـنِ السُّـدُسُ) بەشـی باپـیرە لەگـەڵ دوو بـرادا شەشێكە، واتە: ئەگەر ژمارەیان لە برایەك، یان لە دوو خوشك زیاتر بـیٚ: وەك كیژێكو ژنێكو باپیرەو دوو براو خوشكێك: بنچینەی مەسەلەكەیان لە بیستو چوارە بە لێدانـی سیٚ -كە (وِفْق)ی بەشی باپیرەیە- لە هەشت كە بەشی ژنەكەی لیٚ دەردەچیٚ: نیـوەی -دوانزەیە- بـۆ كیژەكـە، هەشـتێكی -سـیٚیە- بـۆ ژنەكـە، شەشـێكی -چـوارە- بـۆ باپیرە، پاشماوەكەش -پێنجە- بۆ خوشكو برایەكان.

(هَذَا) ئەو ڕوون كردنەوەی ڕابـردوو لـەو حاڵەتـەدا بـوو: (إِذَاذُو الْفَـرْضِ حَـازَ جَـدَّهُ) كـە خاوەن بەش بەشی خۆی ببا، ئینجا (وَفَوْقَ سُدْسٍ قَدْ تَبَقَّى بَعْدَهُ) لـە شەشـێكێك زیـاتر لە پاش خاوەن بەشەكە بمێنێتەوە (أَمَّا إِذَا لَمْ يَبْـقَ عَنْـهُ فَضْـلُ) بـەڵام ئەگـەر هیـچ لـە پاش خاوەن بەشەكان نەماوە: وەك دوو كیژو دایكو مێرد لەگەڵ باپیرەو خوشكو برادا (أَوْ بَقِيَ السُّدُسُ) یان تـەنها شەشێك لـە پـاش خـاوەن بەشـەكان مـاوە: وەك دوو كیـژو دایك لەگەڵ باپیرەو خوشكو برادا (أَوْ أَقَـلُّ) یـان لـە شەشـێك كـەمتر لـە پـاش خـاوەن

فَــــالْجَدُّ فَائِزٌ بِسُـــــدْسٍ عَـــــائِلٍ ١٩٥ أَيْ كُــلاًّ أَوْ بَعْضــاً، وَغَــيْرَ عـــائِلٍ
وَلَيْــسَ لِلإِخْــوَةِ فِــى الْمِــــيرَاثِ ١٩٦ مِــنْ حِصَّــةٍ فِــي الصُّــوَرِ الثَّــلاثِ

---

بەشەکان ماوە: وەك دوو کیژو مێرد لەگەڵ باپیرەو خوشكو برا، لەو سێ وێنانەدا (فَالْجَدُّ فَائِزٌ بِسُدْسٍ عَائِلٍ) باپیرە بە شەشیێکی (عَوْل) کراو بەختەوەر دەبێ (أَيْ كُلاًّ) واتە: گشت شەشیێکەکە (عَوْل) کراو بێ: وەك وێنەی یەکەم (أَوْ بَعْضاً) یان بەشێکی شەشیێکەکە (عَوْل) کراو بێ: وەك وێنەی سێیەم (وَغَيْرَ عائِلٍ) یان شەشیێکەکە (عَوْل) نەکراو بێ: وەك وێنەی دووەم (وَ) هەر کاتێك باپیرە شەشیێکەکەی گرت (لَيْسَ لِلإِخْوَةِ فِى الْمِيرَاثِ مِنْ حِصَّةٍ) خوشكو برایەکان هیچ بەشێکیان لە میراتەکەدا نیەو، بە داگرتنەوەی خاوەن بەشەکان بێ بەش دەبن (فِي الصُّوَرِ الثَّلاثِ) لە هەرسێك وێنەکانی ڕابردوودا، کە بەم شێوەیە ساغ دەبنەوە:

**وێنەی یەکەم:** هیچ لە پاش دایكو مێردو دوو کیژەکان نامێنێتەوە، کەوابوو: شەشیێکێك بۆ باپیرە دادەندرێو لە (عَوْل)ی مەسەلەکە زیاد دەکرێ، چونکە بنچینەی مەسەلەکە لە دوانزەیە بە لێدانی سێ لە چوار: دوو سێیەك –هەشتە– بۆ کیژەکانو، چوارێکی سێیە– بۆ مێردەکەو، شەشیێکی –دووە– بۆ دایکەکە، بەڵام تەواو نەماوەتەوە، کەوابوو: بە نیوەی شەشیێك (عَوْل) دەکرێ بۆ سێزدە، تاکو بەشی دایك تەواو ببێ، جا لەبەر ئەوەی هیچیش بۆ باپیرە نەماوەتەوە، جارێکی تریش بە شەشیێك (عَوْل) دەکرێ بۆ پانزەو، شەشیێکێکی تر بۆ باپیرە دادەندرێ، کەوابوو: خوشكو برایەکانیش بە داگرتنەوەی خاوەن بەشەکان بێ بەش دەبن، بەم شێوەیە:

٤، میراتگر ــــــــ دووکیژ، دایك، مێرد، باپیرە، خوشكو برایەکان
٣ × بەشە میرات ــــ دوو سێیەك، شەشیێك، چوارێك، شەشیێك، پشتێنە
١٢ ÷ ــــــــــــ ٨ + ١ + ٣ + ٠ + بێ بەشن = ١٢
١ + ــــــ (عَوْل) بە نیوەی شەشیێك
٢ + ــــــ (عَوْل)ێکی تر بە شەشیێك
١٥ ÷ ــــــــــ ٨ + ٢ + ٣ + ٢ + ٠ = ١٥

**وێنەی دووەم:** لە پاش دوو کیژو دایکەکە شەشیێکێك دەمێنێتەوە ئەویش دەدرێتە باپیرەو، هیچیش بۆ خوشكو برایەکان نامێنێتەوەو بێ بەش دەبن، چونکە بنچینەی مەسەلەکە لە شەشە –کە بەشی دایکی لێ دەردەچێ–: دوو سێیەك –چوارە– بۆ کیژەکانو، شەشیێکی –یەکە– بۆ دایكو، شەشیێکەکەی ماوەتەوە بۆ باپیرە، بەم شێوەیە:

كَـذَا إِذَا كَـانَ مَـعَ الفَرْعَيْـنِ ١٩٧ فَـرْعِ أَبٍ وَوَلَـدِ الأَصْلَيْـنِ
وَفِـي الْمُقَاسَـمَةِ عَـدَّ أَيْ حَسَـبْ ١٩٨ عَلَيْـهِ فَـرْعُ الأَبَوَيْـنِ فَـرْعَ أَبْ
إِنْ كَـانَ فَـرْعُ الأَبَوَيْـنِ ذَكَـرَا ١٩٩ فَصَـاعِدًا مَـعَ فَـرْدَةٍ أَوْ أَكْـثَرَا

---

| ٦، میراتگر ــــــــ | دوو کیژ، | دایك، | باپیره، | خوشكو برا |
|---|---|---|---|---|
| ١ × بەشە میرات ــــ | دوو سێیەك، | شەشێك، | شەشێك، | پشتێنە |
| ٦ ÷ ــــــــ | ٤ + | ١ + | ١ + | بێ بەشن = ٦ |

**وێنەی سێیەم:** لە پاش دوو کیژەکەو مێردەکە: تەنها یەك –کە لە شەشێك کەمترە– دەمێنێتەوە، چونکە بنچینەی مەسەلەکەیان لە دوانزەیە بە لێدانی سێ لە چوار: دوو سێیەکی –هەشتە– بۆ کیژەکانو، چوارێکی –سێیە– بۆ مێردەکە، جا لەبەر ئەوەی ئەو یەکەی ماوەتەوە لە شەشێك کەمترە، بۆیێ مەسەلەکە بە نیوەی شەشێك (عَوْل) دەکرێ بۆ سێزدە، تاکو شەشێکی باپیرە تەواو ببێ، کەوابوو: خوشكو برایەکانیش بێ بەش دەبن، بەم شێوەیە:

| ٤، میراتگر ــــــــ | دوو کیژ، | مێرد، | باپیره، | خوشكو برا |
|---|---|---|---|---|
| ٣ × بەشە میرات ــــ | دوو سێیەك، | چوارێك، | شەشێك، | پشتێنە |
| ١٢ ÷ ــــــــ | ٨ + | ٣ + | ١ + | بێ بەشن |
| ١ + ــــ (عَوْل) بە نیوەی شەشێك | | | | |
| ١٣ ÷ ــــــــ | ٨ + | ٣ + | ٢ + | ٠ = ١٣ |

## ﴿مەسەلەکانی (المُعادَّة): ژماردراوەکان﴾

(كَذَا) باپیرە هەر بەشە باشترەکەی چوار حاڵەتەکانی ڕابردووی هەیە (إِذَا كَانَ مَعَ الفَرْعَيْنِ) هەر کاتێك لەگەڵ هەردوو جۆرە منداڵەکانیش دابێ (أی) واتە: ئەم جارە (فَرْعِ أَبٍ وَوَلَدِ الأَصْلَيْنِ) خوشكو برای تەنها لە باوکیو خوشكو برای لە دایکیو باوکی گشتیان وێکڕا لەگەڵ باپیرە دابن، بەڵام لێرەدا (وَفِي الْمُقَاسَمَةِ) لە حاڵەتی هاوبەش کردنی باپیرەدا (عَدَّ أَيْ حَسَبَ عَلَيْهِ فَرْعُ الأَبَوَيْنِ فَرْعَ أَبٍ) خوشكو برایەکانی لە دایکیو باوکی –لە دژی باپیرە– خوشكو برایەکانی تەنها لە باوکی لەگەڵ خۆیان دەژمێرن، بەڵام خوشكو برایەکانی تەنها لە دایکی لە دژی باپیرە ناژمێردرێن؟ چونکە ئەوان بەهۆی باپیرە بێ بەش دەبن، ئینجا هەر کاتێك باپیرە بەشە میراتی خۆی گرت، ئەوە تەماشا دەکەین:

(إِنْ كَانَ فَرْعُ الأَبَوَيْنِ ذَكَراً فَصَاعِداً) ئەگەر منداڵەکەی لە دایکیو باوکی: برایەك، یان زیاتر لە برایەك بوو (مَعَ فَرْدَةٍ أَوْ أَكْثَرَا) لەگەڵ خوشکێك، یان زیاتر (أَوْ ذَكَراً مُنْفَرِداً) یان

أَوْ ذَكَـراً مُنْفَـــرِداً أَوْ ذَاتَ حِـــرْ ٢٠٠ مَـعَ ابْنَــةٍ أَوْ ابْنَـةِ ابْـنِ قَـدْ قُــبِرْ

فَبَعْدَ سَـــهْمِ الْجَـدِّ حَـازُوا فَضْـلاً ٢٠١ وَسَــــاقِطٌ فَـــــرْعُ أَب، وَإِلاَّ

فَفَـرْدَةٌ بِنِصْـــفِ مَـــالٍ تَظْفَـــرُ ٢٠٢ وَبِــأَقَلَّ، وَلِكُـــــلٍّ صُــــوَرُ

فَــأَوَّلٌ مِثْــــلُ شَـــقِيقَةٍ وَجَـــدّْ ٢٠٣ مَعَــهُمَا مِــنْ فَـرْعِ وَالِـدٍ وَجَـــدْ

---

برایەکی بە تەنها بوو، واتە: خوشکی لەگەڵدا نەبوو (أَوْ ذَاتَ حِرٍ) یان تەنها خوشك بوون بەڵام (مَعَ ابْنَةٍ أَوْ ابْنَةِ ابْنٍ قَدْ قُبِرْ) لەگەڵ کیژێك، یان کیژە کوڕێکی مردووەکە دابوون، ئەوە (فَبَعْدَ سَهْمِ الْجَدِّ حَازُوا فَضْلاً) لە گشت ئەو وێنانەدا لە دوای بەشی باپیرە، خوشكو برایەکانی لە دایکیو باوکی گشت پاشماوەکە دەگرن، هەر برایەك دوو هەندی خوشکێك دەگرێ -ئەگەر خوشك هەبێ- (وَسَاقِطٌ فَرْعُ أَبٍ) خوشكو برایەکانی تەنها لە باوکیش بە هۆی خوشكو برایەکانی لە دایکیو باوکی بێ بەش دەبن، **بۆ وێنە:** باپیرەو برایەکی لە دایکیو باوکیو برایەکی تەنها لە باوکی، لێرەدا برای لە دایکیو باوکی بە باپیرە دەڵێ: منو ئەم برا لە باوکیەم هەردووکمان بەرامبەر بە تۆ یەکسانینو هەردووکمان برای مردووەکەین، وێکڕا هاوبەشیت لەگەڵ دەکەین: بەشێك بۆ تۆو، دوو بەشیش بۆ ئێمە. باپیرەش کە بیر دەکاتەوە هاوبەشیو سێیەك -لێرەدا- یەکسانن، بۆیێ بەشەکەی خۆی دەباو دەڕوا، ئینجا برای لە دایکیو باوکی بە برای تەنها لە باوکی دەڵێ: من لە تۆ خزمایەتیم بەهێزترە، تا من هەبم تۆ میرات ناگریو تۆ بێ بەشی، بەڵام لە دژی باپیرە تۆم لەگەڵ خۆمدا ژماردبوو...وێنەکانی تریش بەو جۆرە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر منداڵەکانی لە دایکیو باوکی نێرینە نەبوون، بەڵکو تەنها خوشکێك، یان زیاتر بوون، ئەو کاتە (فَفَرْدَةٌ بِنِصْفِ مَالٍ تَظْفَرُ) تاکە خوشکێکی لە دایکیو باوکی -بە هۆی ژماردنی خوشكو برایەکانی تەنها لە باوکی- تا نیوەی میراتەکە دەگرێو (وَبِأَقَلَّ) وا دەبێ: کەمتریش لە نیوە دەگرێو نابێ داوای زیاتر بکا (وَلِكُلٍّ صُوَرُ) هەر یەکە: لە نیوەو کەمتر لە نیوە چەند وێنەیەکیان هەیە:

(**فَأَوَّلٌ**) **وێنەی یەکەم** کە نیوەیە: (مِثْلُ شَقِيقَةٍ وَجَدّ) وەکو خوشکێکی لە دایکیو باوکیو باپیرە: کە (مَعَهُمَا مِنْ فَرْعِ وَالِدٍ وَجَدَ: إِمَّا أَخٌ) یان برایەکی تەنها لە باوکییان لەگەڵدا بێ، واتە: خوشکەکە بە باپیرە دەڵێ: منو ئەم برایەم هەردووکمان بەرامبەر بەتۆ یەکسانینو، وێکڕا هاوبەشیت لەگەڵ دەکەین. کەوابوو: مەسەلەکەیان لە پێنجە -

إِمَّــا أَخٌ أَوْ أُخْـــتٌ أَوْ ثِنْتَـــان ٢٠٤ أَوْ أَخٌ انْضَمَّـــتْ لَـــهُ أُخْتَـــان
أَوْ وَاحِــدٌ ضُمَّــتْ إِلَيْــهِ وَاحِــدَةْ ٢٠٥ أَوْ ذَا وَذِي مَــعَ ازْدِيَــادِ وَالِــدَةْ

که ژمارەی سەری میراتگرەکانە– چونکە لێرەدا هاوبەشی بۆ باپیرە بەسوودترە: دوو بۆ باپیرە، دوو بۆ برایەکە، یەکێك بۆ خوشکەکە، ئینجا خوشکەکە بە برایەکە دەڵێ: من خاوەن بەشم، تا بەشی من تەواو نەبێ، نابێ تۆ میرات بگری، کەواتە: لە بەشی خۆت نیوەم بۆ تەواو بکە، جا لەبەر ئەوەی پێنج نیوەیی ساغی نیە، بۆیێ دوو –کە نیوەی لێ دەردەچێ– لە مەسەلەکەی دەدەینو، لە دە ساغ دەبێتەوە: چواری بۆ باپیرە بە هاوبەشیو، پێنجی –کە نیوەیە– بۆ خوشکەکەیە بە خاوەن بەشیو، یەکێك بۆ برایەکە دەمێنێتەوە بە (عَصَبَة)یی، **ئینجا بزانە:** ئەم مەسەلەیە پێ دەگوترێ (عُشْرِيَّة زَيْد) ﷺ.

(أَوْ أُخْتٌ) یان لەگەڵ باپیرەو خوشکی لە دایکیو باوکیدا خوشکێکی تەنها لە باوکی هەبێ، مەسەلەکەیان لە چوارە –ژمارەی سەرەکان– دووی بۆ باپیرە بە هاوبەشیو، دووەکەی تریش بۆ خوشکەکەی لە دایکیو باوکی بە خاوەن بەشیو، خوشکە لە باوکییەکەش بێ بەش دەبێ. (أَوْ ثِنْتَانِ) یان دوو خوشکی تەنها لە باوکی هەبن، بنچینەی مەسەلەکەیان لە پێنجە، بەڵام لە بیست ساغ دەبێتەوە –بە لێدانی لێدەرچووی چوارێکە بەشێك لە مەسەلەکە–: هەشتی بۆ باپیرەیە بە هاوبەشیو، دەی بۆ خوشکەکە بە خاوەن بەشیو، دووەکەی تریش بۆ هەردوو خوشکەکان (أَوْ أَخٌ انْضَمَّتْ لَهُ أُخْتَانِ) یان برایەکی تەنها لە باوکیو دوو خوشکی تەنها لە باوکیش لەگەڵیاندا بێ، مەسەلەکەیان لە شەشە: سێیەکی –دووە– بۆ باپیرەو، نیوەی –سێیە– بۆ خوشکەکەو، پاشماوەکەیشی –یەکە– بۆ براو خوشکەکانی تەنها لە باوکی، کەواتە لە بیستو چوار ساغ دەبێتەوە (أَوْ وَاحِدٌ ضُمَّتْ إِلَيْهِ وَاحِدَةْ) یان برایەکی تەنها لە باوکیو خوشکێکی تەنها لە باوکی لەگەڵیاندا بێ، مەسەلەکەیان لە شەشە: سێیەکی بۆ باپیرەو، نیوەی بۆ خوشکەکەو، پاشماوەکەیشی بۆ خوشكو برایەکەی تەنها لە باوکی، کەواتە: لە هەژدە ساغ دەبێتەوە (أَوْ ذَا وَذِي مَعَ ازْدِيَادِ وَالِدَةْ) یان خوشكو برایەکی تەنها لە باوکیو هەم دایکی مردووەکەشیان لەگەڵدا بێ، بنچینەی مەسەلەکەیان لە شەشەو، دەگاتە هەژدە: شەشێکی –سێیە– بۆ دایکەکەو، سێیەکی پاشماوەکەش –پێنجە– بۆ باپیرەو، نیوەیشی –نۆیە– بۆ خوشکەو، پاشماوەکەش –

أَوْ أَخَـــوَانِ مَعْـــهُمَا هَاتَـــــانِ ٢٠٦ أُمٌّ وَأُخْـــتٌ، وَمِثَـــالُ الثَّـــانِي شَــقِيقَةٌ وَالأُخْـــتُ مِـــنْ أَبٍ وَجَـــدٌّ ٢٠٧ وَزَوْجَـــةٌ، وَإِنْ هُنَـــا أُمٌّ تُـــزَدْ

---

يەكە— بۆ خوشكو برايەكەی تەنها لە باوكی، كەواتە: ژمارەكەیان —كە سێیە— لە هەژدە دەدەینو، لە پەنجاو چوار ساغ دەبێتەوە (أَوْ أَخَوَانِ مَعْهُمَا هَاتَانِ) یان دوو برای تەنها لە باوكیو ئەم دووانە، واتە: (أُمٌّ وَأُخْتٌ) دایكو خوشكێكی تەنها لە باوكیان لەگەڵدا بێ، بنچینەی مەسەلەكەیان لە شەشە، بەڵام دەگاتە هەژدە: شەشێكی بۆ دایكەكەو، سێیەكی پاشماوەكەش بۆ باپیرەو، نیوەی بۆ خوشكەكەو، پاشماوەكەش —یەكە— بۆ خوشكو برایەكانی تەنها لە باوكی، كەواتە: ژمارەكەیان —كە پێنجە— لە هەژدە دەدەینو، لە نەوەد ساغ دەبێتەوە.
(وَمِثَالُ الثَّانِي) **وێنەی دووەم** كە كەمتر لە نیوەیە: (شَقِيقَةٌ وَالأُخْتُ مِنْ أَبٍ وَجَدٌّ وَزَوْجَةٌ) خوشكێكی لە دایكیو باوكیو خوشكێكی تەنها لە باوكیو باپیرەو ژنێك، مەسەلەكەیان لە چوارە —كە بەشی ژنەكەی لێ دەردەچێ—: چوارێكی —یەكە— بۆ ژنەكەیە، ئینجا خوشكی لە دایكیو باوكی بە باپیرە دەڵێ: منو ئەم خوشكە لە باوكیەم بەرامبەر بە تۆ یەكسانینو، وێكڕا هاوبەشیت لەگەڵ دەكەین جا لەبەر ئەوەی پاشماوەكە سێیەو بەسەر چواردا —كە ژمارەی باپیرەو خوشكەكانە— بەش نابێ، بۆیێ ژمارەكەیان لە مەسەلەكە دەدەینو لە شانزە ساغ دەبێتەوە: چواری بۆ ژنەكەو، شەش بۆ باپیرە بە هاوبەشیو، شەشەكەی تریش بۆ هەردوو خوشكەكان هەر یەكەو سێیان، بەڵام خوشكەكەی لە دایكیو باوكی بە خوشكەكەی تەنها لە باوكی دەڵێ: من خزمایەتیم لە تۆ بەهێزترە، تا من بەشە میراتی خۆم —كە نیوەیە— نەگرم نابێ تۆ میرات بگری، بەڵام من لە دژی باپیرە تۆم لەگەڵ خۆمدا ژماردبوو، كەوابوو: سێیەكەی خۆت بدەوە من، تۆش بێ بەشی، كەواتە: بەشی خوشكی لە دایكیو باوكی لێرەدا —كە شەشە— لە نیوەیی كەمترەو، دەبی پێی ڕازی بێو نابێ داوای زیاتر بكاو، خوشكەكەی تەنها لە باوكیشی بێ بەشە.
(وَإِنْ هُنَا أُمٌّ تُزَدْ) ئەگەر لێرەدا لە وێنەی ڕابردوودا دایك زیاد بكرێ، ئەوە مەسەلەكە لە دوانزەیە —بە لێدانی (وِفْق)ی بەشی ژنەكە لە بەشی دایكەكە—: چوارێكی —سێیە— بۆ ژنەكەو، شەشێكی —دووە— بۆ دایكەكەو، پاشماوەكەش بۆ باپیرەو خوشكەكانەو بەسەریاندا بەش نابێ، كەوابوو: ژمارەكەیان —كە چوارە— لە مەسەلەكە دەدرێو لە

أَوْ كَانَتْ أُمٌّ وَمَكَانَ الأُخْتِ ٢٠٨ أَخٌ فَإِنَّ الأَصْلَ ضِعْفُ سِتٍّ
وَحَظِيَتْ مَنْ فَوْقَ فَرْدَةٍ بِمَا ٢٠٩ يَعْدِلُ ثُلْثَيْنِ وَمَا دُونَهُمَا
مِثْلُ شَقِيقَتَيْ وَجَدٍّ ذِي عَطَبْ ٢١٠ مَعَ أَخٍ لِلأَبِ أَوْ أُخْتٍ لأَبْ

---

چل‌و هەشت ساغ دەبێتەوە: دوانزە بۆ ژنەکەو، هەشت بۆ دایکەکەو، چواردە بۆ باپیرە بە هاوبەشیو، خوشکەکانیش هەر یەکەو حەفتیان، ئینجا خوشکەکەی لە دایکیو باوکی حەفتەکەی تر لە خوشکەکەی تەنها لە باوکی وەردەگرێتەوەو، پێی ڕازی دەبێ، هەرچەند لە نیوەش کەمترە، خوشکەکەی لە باوکیش بێ بەش دەبێ (أَوْ كَانَتْ أُمٌّ وَمَكَانَ الأُخْتِ أَخٌ) یان هەر لەو مەسەلەیەدا ئەگەر دایك هەبوو، بەڵام لە جیاتی خوشکەکەی تەنها لە باوکی برایەکی تەنها لە باوکی هەبوو، ئەو کاتەش (فَإِنَّ الأَصْلَ ضِعْفُ سِتٍّ) بنچینەی مەسەلەکە هەر لە دوانزەیە، بەڵام لە شەست ساغ دەبێتەوە بە لێدانی پێنج -کە ژمارەی باپیرەو خوشکەکەو برایەکەیە- لە مەسەلەکە: پانزە بۆ ژنەکەو، دە بۆ دایکەکەو، چواردە بۆ باپیرە بە هاوبەشیو، چواردەش بۆ برایەکەو، حەفتیش بۆ خوشکەکە، ئینجا خوشکەکەش چواردەکە لە برایەکە دەستێنێتەوەو بەشەکەی دەگاتە بیستو یەك‌و دەبی پێی ڕازی بێ، هەرچەند لە نیوەش کەمترە، برایەکەش بێ بەش دەبێ.

(وَ) هەروەها ئەگەر تەنها خوشکی لە دایکیو باوکی هەبوون‌و برای خۆیان لەگەڵدا نەبوو، ئەو کاتەش (حَظِيَتْ مَنْ فَوْقَ فَرْدَةٍ بِمَا يَعْدِلُ ثُلْثَيْنِ) دوو خوشك‌و زیاتر -بە هۆی ژماردنی خوشك‌و برایەکانی تەنها لە باوکی- تا دوو سێیەکی میراتەکە دەگرن‌و (وَمَا دُونَهُمَا) وا دەبێ: کەمتریش لە دوو سێیەك دەگرن‌و دەبی پێی ڕازی بن، **وێنەی یەکەم** کە دوو سێیەکە: (مِثْلُ شَقِيقَتَيْ وَجَدٍّ ذِي عَطَبْ مَعَ أَخٍ لِلأَبِ) وەکو دوو خوشکی لە دایکیو باوکیو باپیرەی مردووەکە لەگەڵ برایەکی تەنها لە باوکی، لەم مەسەلەیەدا هاوبەشیو سێیەکی میراتەکە بۆ باپیرە یەکسانن، چونکە خوشکەکان بە باپیرە دەڵێن: ئێمەو ئەو برایەمان وێکڕا هاوبەشیت لەگەڵ دەکەین، کەوابوو: مەسەلەکە لە شەشە -کە ژمارەی سەری میراتگرەکانە-: سێیەکی -دووە- بۆ باپیرەو، دوو سێیەکەکەی تریش خوشکەکان دەیگرن، چونکە بە برایەکە دەڵێن: ئێمە خاوەن بەشین، تا بەشی ئێمە تەواو نەبێ، نابێ تۆ میرات بگری، کەواتە: دووەکەی خۆت بۆ ئێمە واز لێ بێنە، تاکو دوو سێیەکمان بۆ تەواو ببێ، تۆش بێ بەشی بەڵام ئێمە لە دژی باپیرە تۆمان لەگەڵ خۆماندا ژماردبوو.

وَلَيْـــسَ عَـــنْ ثُلْثَيْـــنِ شَـــيْءٌ يَفْضُـــلُ ٢١١ وَمَـــا عَـــنِ النِّصْـــفِ يَزِيـــدُ يُجْعَـــلُ
لِوَلَـــدِ الْوَالِـــدِ، وَاعْلَـــمْ أَنْ لاَ ٢١٢ فَـــرْضَ لأُخْـــتٍ مَـــعَ جَـــدٍّ إِلاَّ
فِـــي الأَكْدَرِيَّـــةِ: هِـــيَ الأُمُّ وَجَـــدٌّ ٢١٣ وَالزَّوْجُ وَالأُخْتُ الَّتِي كَـــانَتْ وَلَـــدْ
أَبٍ أَوِ الأَصْلَيْـــنِ فَـــالْجَدُّ يَـــرِثْ ٢١٤ سُدْساً وَفَرْضُ الأُخْتِ نِصْفٌ وَالثُّلُـــثْ

---

**وێنەی دووەم** کە کەمتر لە دوو سێیەکە: (أَوْ أُخْتٍ لأَبٍ) یان خوشکێکی تەنها لە باوکی، واتە: لەگەڵ باپیرەو دوو خوشکی لە دایکیو باوکی مردووەکە، مەسەلەکە لە پێنجە –کە ژمارەی سەری میراتگرەکانە–: دوو بۆ باپیرەیە بە هاوبەشیو، سێیەکەی تریش بۆ خوشکەکانی لە دایکیو باوکیەو دەبی پێی ڕازی بن، هەرچەندە لە دوو سێیەکیش کەمترە، واتە: خوشکەکەی لە باوکیش بێ بەش دەبێ. **ئینجا بزانە:** (وَلَيْسَ عَنْ ثُلْثَيْنِ شَيْءٌ يَفْضُلُ) هیچ شتێك لە دوو سێیەکەکە زیاد نابێو بۆ خوشكو برایەکانی تەنها لە باوکی نامێنێتەوە: وەك دوو وێنەکەی ڕابردوو، بەلاّم (وَمَا عَنِ النِّصْفِ يَزِيدُ) ئەوەندەی هەندێ جار لە نیوەییەکە زیادەو دەمێنێتەوە، ئەوە (يُجْعَلُ لِوَلَدِ الْوَالِدِ) بۆ خوشكو برایەکانی تەنها لە باوکی دادەندرێ: وەك وێنەکەی (عُشْرِيَّةُ زَيْدٍ)ی ڕابردوو.

## مەسەلەکەی (الأَكْدَرِيَّةُ)

(وَاعْلَمْ) بزانە: ئەگەر باپیرە لەگەڵ تەنها خوشکەکاندا بێ، –واتە: برایان لەگەڵدا نەبێ– ئەو کاتەش هەروەك لەگەڵ برادا بێ، ئەوهایە، کەوابوو: (أَنْ لاَ فَرْضَ لأُخْتٍ مَعَ جَدٍّ) هیچ بەشە میراتێك بۆ خوشك دیاری ناکرێ ئەگەر لەگەڵ باپیرەدا بێ –جگە لە مەسەلەکانی (المُعادّة): ژماردراوەکانی ڕابردوو– و هەم بە هۆی خوشکەکانیش مەسەلەکە (عَوْل) ناکرێ (إِلاَّ فِي الأَكْدَرِيَّةِ) تەنها لە مەسەلەی (الأَكْدَرِيَّةِ) نەبێ، بۆیێ بە (الأکدرية) ناو دەبرێ، چونکە مەزهەبەکەی (زَيْدِ بنِ ثَابِتٍ)ی لێڵ کردوە بە هۆی بەش دانان بۆ خوشکەکە (هِيَ) مەسەلەکە ئەمەیە: (الأُمُّ وَجَدٌّ وَالزَّوْجُ وَالأُخْتُ الَّتِي كَانَتْ وَلَدَ أَبٍ أَوِ الأَصْلَيْنِ) دایكو باپیرەو مێردو تاکە خوشکێکی لە دایکیو باوکی، یان تەنها لە باوکی، مەسەلەکە لە شەشە بە لێدانی دوو لە سێ –کە بەشی مێردو دایکیان لێ دەردەچێو– بەم شێوەیەی داهاتوو بەش دەکرێ:

(فَالْجَدُّ يَرِثُ سُدْساً) باپیرە شەشێکی میراتەکە –کە یەکە– دەگرێ (وَفَرْضُ الأُخْتِ نِصْفٌ) بەشی خوشکەکەش نیوەیە –کە سێیە– چونکە هیچ کەسێك نیە بێ بەشی بکاو، باپیرەش نایکاتە (عَصَبَة)، هەم (وَالثُّلُثُ لِلأُمِّ) سێیەك –کە دووە– بۆ دایك

لــلأُمِّ والنِّصْــفُ نَصيــبُ البعْــــلِ ٢١٥ فــتَرْتَقي لِتِسْـــعَةٍ بِـــالْعَوْلِ
مِنْــها لأُخْــتٍ مَــع جــدٍ أرْبعـــةٌ ٢١٦ كاملـــةٌ عليْـــهِما مُوزَّعَـــةْ
والْجَـــدُّ مَحْسُــوبٌ كَـــأُنْثَيين ٢١٧ تَــأْخُذُ ثُلْثــاً وَحَــوَى ثُلْثَيْـــن
رُوعِــيَ تَعْصيــبٌ وَرُوعِــيَ الرَّحِــمْ ٢١٨ فِي الفَرْضِ لِلأُخْتِ وَفي قَسْــمٍ عُلِــمْ
وَلَــمْ يُعصِّبْــهَا فَفــي تعْصِيبِـــهِ ٢١٩ نُقْصانُــهُ عَــنْ سُــدُسٍ نَصِيبِـــهِ

---

(وَالنِّصْفُ نَصيبُ البَعْلِ) نيوەيەكى تريش –سىٚيە– بەشى مێردەكەيە، جا بۆ ئەوەى خوشكەكە بێ بەش نەبێ (فَتَرْتَقي لتِسْعَةٍ بِالْعَوْلِ) مەسەلەكە بە بەشى خوشكەكە (عَوْل) دەكرێ بۆ نۆ، جا لەبەر ئەوەى بە هيچ ڕێگايەك ناگونجێ خوشكەكە لە باپيرە زياتر ببا، بۆيێ لە دواى بەشكردنى ميراتەكە باپيرەو خوشكەكە دەگەڕێنەوە سەر (عَصَبَة)يەتىو، بەشەكانى خۆيان وەكو خوشكو برا بەش دەكەن، كەوابوو: (مِنْهَا) لەو نۆيە (للأُخْتِ مَعَ الجَدِّ أَرْبَعَةٌ كَامِلَةٌ) چوارى تەواو بۆ باپيرەو خوشكەكەيە (عَلَيْهِمَا مُوَزَّعَةْ) بەسەر هەردووكياندا بەش دەكرێو (وَالْجَدُّ مَحْسُوبٌ كَأُنْثَيَيْن) باپيرە وەكو دوو خوشك دەژمێردرێ، واتە: (تَأْخُذُ ثُلْثاً) خوشكەكە سێيەكێك دەگرێو (وَحَوى ثُلْثَيْن) باپيرەش دوو سێيەك دەگرێ، جا لەبەر ئەوەى چوار بەسەر سێ دابەش نابێ، بۆيێ سێ –كە ژمارەى سەرى باپيرەو خوشكەكەيە– لە نۆ دەدەين –كە مەسەلە (عَوْل) كراوەكەيە– لە بيستو حەفت ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەيە:

٣، ميراتگر ــــــــــــ مێرد، دايك، باپيرە، خوشك
٢ × بەشە ميرات ــــــــ نيوە، سێيەك، شەشێك، نيوە
٦ ÷ ــــــــــــــــ ٣ + ٢ + ١ + ٠ = ٦
٣ + ــــــــ (عَوْل) بە نيوەى مەسەلەكە
٩ ÷ ــــــــــــــــ ٣ + ٢ + ١ + ٣ = ٩
٣ × ــــــــ ساغكردنەوە بە ژمارەى باپيرەو خوشك كە سىٚيە
٢٧ ÷ ــــــــــــــ ٩ + ٦ + ١٢ بۆ باپيرەو خوشكەكە = ٢٧

(رُوعِي تَعْصِيبٌ) لە هاوبەشى كردنەكەدا (عَصَبَة)يەتى ڕەچاو كراوەو (وَرُوعِيَ الرَّحِمُ في الفَرْضِ للأُخْتِ) خزمايەتى ڕەحميش ڕەچاو كراوە لە بەش داناندا بۆ خوشكەكە (وَفي قَسْمٍ عُلِمْ) هەروەك (عَصَبَة)يەتى ڕەچاو كراوە لە هاوبەشىى باپيرەو خوشكەكەدا –كە زاندراوە– بەلاّم (وَلَمْ يُعَصِّبْهَا) باپيرە خوشكەكەى نەكردۆتە (عَصَبَة)، لە كاتى بەشكردنى ميراتەكەدا، چونكە (فَفي تَعْصِيبِهِ نُقْصَانُهُ عَنْ سُدُسٍ نَصِيبِهِ) ئەگەر

وَلَـوْ أخـاً فَرْضَتَـهُ مَنْصُوبَـاً ۲۲۰ مَكَانَ الأُخْـتِ مَـاَ حَـوَى نَصِيبـاً

هَذا بَيانُ مَوانِعِ الإرْثِ وَمَا مَعَهَا

الْكَـافِرَان يَتوارَثَـان ۲۲۱ وَلَـوْ عَلَـى تَخَـالُفِ الأَدْيَـان

لا مُسْـلِمٌ وكَـافِرٌ شَـقِيٌّ ۲۲۲ وَلاَ سِـوَى الْحَرْبِـيِّ وَالْحَرْبِـيُّ

وَمُتوارِثَـانِ مَاتَـا بِغَـرَقْ ۲۲۳ وَنَحْـوِهِ إِذْ جُـهِلَ الَّـذِي سَـبَقْ

---

خوشکەکە بکاتە (عَصَبَة)، ئەوە خوشکەکە لە شەشیێکەکەدا هاوبەشیی لەگەڵ دەکردو بەشی باپیرە لە شەشیێکیش کەمتر دەبۆوە (وَلَـوْ أخـاً فَرْضَتَـهُ مَنْصُوباً مَكَانَ الأُخْـتِ) ئەگەر لە جیاتی خوشکەکە –لەم مەسەلەیەدا– برایەك هەبووایە، ئەوە (مَـا حَـوَى نَصِيباً) هیچ بەشە میراتی نەدەگرت، چونکە بە داگرتنەوەی: خاوەن بەشەکان بێ بەش دەبوو.

**﴿هذا بيانُ موانعِ الإرْثِ وما معها : ئەمە ڕوونکردنەوەی هۆیەکانی میرات نەگرتنە﴾**

واتە: ئەو ڕووداوانەی قەدەغە دەکەن مرۆڤ ببێتە میراتگر، هەرچەند هۆیەکانی میراتگرتنیشی تێدا هاتبێتە جێ **قەدەغەی یەکەم:** جیاوازیی ئایین، کەوابوو: (اَلْكَافِرانِ يَتَوارَثَانِ) کافرەکان میرات لە یەکتری دەگرن (وَلَـوْ عَلَـى تَخالُف الأَدْيَان) هەرچەند شەریعەتەکەشیان جیاواز بێ: وەکو جولەکەو دیان = گاور، چونکە ﴿الْكُفْـرُ مِلَّةٌ واحِدَةٌ﴾ ڕێبازەکانی کوفر –لە پوچەڵیدا– گشتی یەك ڕێبازە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّـلاَلُ﴾ ئایا لە دوای ڕاستی جگە لە گومڕایی هیچی تر هەیە؟. (لاَ مُسْلِمٌ وَكَافِرٌ شَقِيٌّ) بەڵام موسوڵمانو کافری بەدبەخت میرات لە یەکتری ناگرن، هەرچەند لە دوای مردن پێش بەشکردنی میراتەکەش ببێتە موسوڵمان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ يرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَـافِرَ، وَلاَ الْكَـافِرُ الْمُسْـلِمَ﴾ رواه البخاري ومسلم، موسوڵمان میرات لە کافر ناگرێو کافریش میرات لە موسوڵمان ناگرێ.

(وَ) هەروەها (لاَ سِوَى الْحَرْبِيِّ وَالْحَرْبِيُّ) کافری پەیمان لە ئەستۆو کافری جەنگی میرات لە یەکتری ناگرن: وەك یەکێك جەنگ لە دژی موسوڵمانان بکاو خزمەکەیشی لە ناو موسوڵماناندا بە دۆستایەتی (ذِمَّة) دانیشتبێ.

**قەدەغەی دووەم:** نەزانینی کاتی مردن، کەوابوو: (وَمُتَوَارِثَـانِ مَـاتَا) ئەگەر دوو کەس، یان زیاتر –کە میرات لە یەکتری دەگرن– وێکڕا مردن (بِغَرَقٍ) بەهۆی نقووم بوون لە

وَوَلَـدُ الزِّنَـا عَـنِ الإِرْثِ حُـرِمْ ٢٢٤ إِلاَّ مِـنَ الأُمِّ وَمِـنْ وَلَـدِ الأُمّْ
لاَ يَـرِثُ الْمَنْفِـيُّ بِاللِّعَـان ٢٢٥ وَقَـاتِلٌ وَلَـوْ بِـلاَ ضَمَـان

---

ئاودا (وَنَحْوِه) یان بە هۆی ڕووداوێكی تری بە كۆمەڵ: وەك ڕوخانی دیوارێك، یان چیایەك، یان بە هۆی سووتان، یان وەرگەڕانی ئۆتۆمبێل، یان تەقینەوەی بۆمبێك، یان لە شوێنێكی دوور وولات مردبوون (إِذْ جُهِلَ الَّذِي سَبَقَ) لەو حاڵەتانەشدا نەزاندرا كامەیان پێشتر مردوە، ئەو مردووانە هیچیان میرات لە یەكتری ناگرن، بە (إجماع)ی (صحابة)ی پێغەمبەر ﷺ، چونكە مەرجێكی میراتگرتن ئەمەیە: لە كاتی مردنی میراتدەرەكە بێگومان میراتگرەكە زیندوو بێ، هەرچەند بە ماوەی چاولێكردنێكیش بێ، هەروەك لە مەرجەكانی میراتگرتندا ڕابرا، واتە: ئەگەر لێرەشدا بزاندرێ كامەیان بە ماوەی چاولێكردنێك، یان زیاتر لە دوای ئەوی تر مردوە، ئەوە دواكەوتووەكە میرات لە پێشكەوتووەكە دەگرێ، چونكە مەرجەكە هاتۆتە جێ، ئەگەر نا: نا، كەوابوو:ماڵی هەر یەكێك لەو وێكڕا مردووانەی ڕابردوو بۆ میراتگرەكانی تریەتی: كە لە كاتی مردنی ئەواندا زیندوو بوونە، چونكە خوای گەورە زیندووی كردوونە میراتگری مردووان.
**قەدەغەی سێیەم:** نەبوونی نەژادی شەرعی، كەوابوو: (وَوَلَدُ الزِّنَا) منداڵی بیژی -كە لە زینا پەیدا بووە- (عَنِ الإِرْثِ حُرِمَ) لە میراتی زیناكەرەكەو خزمەكانی زیناكەرەكە بێ بەش كراوەو میراتیان لێ ناگرێو، ئەوانیش میرات لەوی ناگرن، چونكە بەهۆی زینا نەژاد پەیدا نابێ (إِلاَّ مِنَ الأُمِّ وَمِنْ وَلَدِ الأُمِّ) منداڵە بیژییەكە تەنها لە دایكی خۆیو لە خوشكو برایەكانی لە دایكیی میرات دەگرێو ئەوانیش میرات لەوی دەگرن، چونكە نەژادی لای دایكی بێ گومانە. هەروەها (لاَ يَرِثُ الْمَنْفِيُّ بِاللِّعَانِ) ئەو منداڵەی -بەهۆی لەعنەت كردنی ژنو مێرد- حاشایی لێ كراوە، ئەویش میرات لە لەعنەتكەرەكەو خزمەكانی لەعنەتكەرەكە ناگرێو، ئەوانیش میرات لەوی ناگرن، چونكە نەژادی شەرعیی نیە.
**قەدەغەی چوارەم:** كوشتن، كەوابوو: (وَقَاتِلٌ) مرۆڤكوژ میرات لە كوژراوەكەی خۆی ناگرێ (وَلَوْ بِلاَ ضَمَانِ) هەرچەند نەشبێتە زامنو تۆڵەی كوشتنەكەی نەكەوێتە سەر، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ لِلْقَاتِلِ مِنْ مَقْتُولِهِ شَيْءٌ﴾ صححه ابن عبد البرّ، مرۆڤكوژ هیچ بەشێكی لە میراتی كوژراوی خۆی نیە. **ئینجا بزانە:** جیاوازی نیە كوشتنەكە: بە هەق بێ، یان بەناهەق، بەخۆشی خۆی بێ، یان بە زۆر لێكردن، بە هەڵە

وَلاَ مَـــنِ ارْتَـــدَّ وَلاَ الزِّنْدِيـــــقُ ٢٢٦ لَــمْ يُورَثَـــا، كَذَلِـــكَ الرَّقِيــقُ
إلاَّ مُبَعَّضــــاً فَـــذَاكَ إِنْ هَلَــــكْ ٢٢٧ يُــورَثُ مَــا بِبَعْضِــهِ الْحُــرِّ مَلَــكْ

---

بێ، یان بـه قەسدی، بـه ویستی خۆی بێ، یان بێ ویستی خۆی: وەك خـەوتوویێك بکەوێتـه سـەر یـەکێكو بیکوژێ، ڕاستەوخۆ بێ، یـان بـه هۆیـەکی دەرەکـی: وەك شـاهیدیی لەسـەر بـداو بـەهۆی شـاهیدیەکەی بکوژرێ، هـەروەك لـه (تحفة)و (شـرح الرحبة)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾ **یەکەم:** هەر کەسێك پاراستنی شتێکی له ئەستۆدا بـێ: وەك وولاغێـك لێ بخورێ، یان ڕاییکێشێ، ئەوە ئەگـەر بـه هـۆی ئـەو وولاغـه کەسێك بکوژێ مـیراتی لێ نـاگرێ، هـەروەك لـه (تحفـه)دا فەرموویـەتی: ئـەوەش وا دەگەیـەنێ: ئەگـەر شـوفێری ئۆتۆمبیلێـك بـه ئۆتۆمبیلەکـەی خزمێکـی خـۆی بکـوژێ، یـان لـه کـاتی لێخوڕیـن ئۆتۆمبێلەکەی وەربگەڕێو خزمەکانی ناو ئۆتۆمبیلەکەی بمرن، ئەوە میرات لـەو خزمـه مردووانه ناگرێ، هەرچەند کەمتەرغەمیشـی نـەکردبێ، یـان بـه خۆیشـی بـه هـۆی ئـەم ڕووداوه بمرێ، جیاوازی نیه ئۆتۆمبیلەکە: موڵکی خۆی بێ، یان نا، چونکه ئەو بووەته هۆی کوشتنو، زامینیش مەرج نیه.

**دووەم:** وا دەبێ کوژراوەکه میرات له بکوژەکـەی خـۆی دەگـرێ: وەك برایـەك برایـەکی خۆی بریندار بکا، ئینجا یەکسەر بەخۆی بمرێ، یان بکوژرێ، ئینجـا لـه دوای ماوەیـەك برا بریندارەکەش بەو برینه بمرێ، هەروەك له (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانه.

**قەدەغـەی پێنجـەم:** کـافر بـوون، کـەوابوو: (وَلاَ مَنِ ارْتَدَّ) هـەر کەسـێك لـه ئـایین وەرگـەڕابێو بووبێتـه کـافر، مـیرات نـاگرێ، واتـه: ئەگـەر لـه کـاتی مردنـی مـیرات لێگیراوەکەدا کافر بێ، هەرچەند له دوای مردنەکەیشی ببێتەوە موسوڵمان (وَلاَ الزِّنْدِيقُ) هەروەها مرۆڤی بێ دین –که له هیچ ئایینێکدا نەبێ– ئەویش میرات نـاگرێ، هـەروەها (لَمْ يُورَثَا) مرۆڤی وەرگەڕاوو، مرۆڤی بێ دین –ئەگـەر بـه کـافری بمـرن– میراتیـان لێ ناگیرێ، به بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو، کەوابوو: گشت ملكو ماڵەکەیان به (فَيْء) بۆ (بَيْت الْمَال) سەرف دەکرێ، هەروەك له (تحفه)و (مغنی)دا فەرموویانه.

**قەدەغەی شەشەم:** کۆیلەیی، کەوابوو: (كَذَلِكَ الرَّقِيقُ) هەروەها کۆیلەش میرات نـاگرێو میراتیشی لێ ناگیرێ (إلاَّ مُبَعَّضاً) تەنها ئەو کۆیلەیە نەبێ: که بەشێکی ئازادە (فَذَاكَ إِنْ هَلَكَ) ئەوە ئەگەر مرد (يُورَثُ مَا بِبَعْضِهِ الْحُرِّ مَلَكَ) ئەو میراتەی لێ دەگیرێ: که به بەشه

وَكَـافِراً جَنَـــى عَلَيْـــهِ جَـــان ٢٢٨ حُــرّاً مَصُـونَ الـــدَّم بالأمَـــان
وَبعْــدَ أنْ نَكَــث مَـــا اسْـــتَحقَّهُ ٢٢٩ سَـبَاهُ مَـــنْ سَـــبَاهُ وَاسْـــتَرَقَّهُ
ومَـاتَ مِـــنْ سِـــرايَةٍ فَقَـــدْرُ ٢٣٠ دِيَتِــــهِ لِــــوَارِث لاَ غَــــيْرُ
إذَا أخُـــو مَيْــتٍ أقَــــرَّ بنَســـبْ ٢٣١ إبْنٍ فلَيْـــس الإبْـــنُ يُعْطَـــى إرْثَ أبْ
وَإنْ يَقَــعْ تَـرَدُّدٌ فِـــى النَّسَـــب ٢٣٢ فَــذاكَ مَـــانِعٌ مِـــنْ إرْث النَّشَــــب
وَكَــوْنُ مَــنْ مَــاتَ نَبيّــاً مَــــانِعُ ٢٣٣ لــلإرْث وَالْحَدِيــثُ فِيــهِ شَـــائِعُ

---

ئازادی‌یەكەی پەیدای كردوە (وكَافِراً جَنَى عَلَيْهِ جَانِ) هەم تەنها ئەو كافرەش نەبێ: كە یەكێك دەستدرێژی‌یەكی بكاتە سەر (حُرّاً مَصُونَ الدَّمِ بالأمَـانِ) كافرەكـەش ئـازاد بـێو بەهۆی ئەمین كردن خوێنەكەی پارێزراو بێ، ئینجا (وَبعْدَ أنْ نَكَثَ مَا اسْتَحَقَّهُ) لـە دوای ئەوەی كافرەكە پەیمانی ئەمینی‌ی هەڵوەشاندەوە (سَبَاهُ مَنْ سَبَاهُ وَاسْتَرَقَّهُ) یـەكێك گرتـی‌و كردیە كۆیلـەی خـۆی، ئینجـا (وَمَـاتَ مِـنْ سِـرايَةٍ) بـە هـۆی پێـدا ڕۆیشـتنی دەستدرێژی‌یەكە مرد، ئەوە (فَقَدْرُ دِيَتهِ لِوَارِثٍ) ئـەندازەی تۆڵـەی دەستدرێژی‌یەكە بـۆ میراتگری كافرەكەیە (لاَ غَيْرُ) بۆ كەسی تر نیە.
**قەدەغەی حەوتەم:** (الدَّوْرُ الْحُكْمِيُّ) خولانـەوەی بڕیـاری شـەرعی، كـەوابوو: (إذَا أخُـو مَيْتٍ أقَرَّ بِنَسَبِ إبْنٍ) هەر كاتێك برایەك دان بهێنێ بە نەژادی كوڕێكـی نەناسـراو بـۆ بـرا مردووەكەی، ئەوە (فَلَيْسَ الإبْنُ يُعْطَـى إرْثَ أبٍ) ئـەم كـوڕە هەرچـەندە دەبێتـە كـوڕی مردووەكە، بـەڵام مـیراتی باوكەكـەی نادرێتـێ، چونكـە مـەرجی دانهێنـەرەكە ئەوەیە: میراتگر بێ، جا ئەگەر كوڕەكە میرات بگرێ ئەو برایە لە میراتگرایەتی بێ بەش دەبـێو هـەر كـاتێكیش بـێ بـەش ببـێ دانهێنانەكـەی دروسـت نابـێو كوڕەكـە نابێتــە كــوڕی مردووەكە، كەواتە: میراتگرتنی كوڕەكە دەبێتە هۆی میرات نەگرتنی.
(وَإنْ يَقَعْ تَرَدُّدٌ فِـى النَّسَبِ) ئەگـەر گومـان لـە نـەژاددا پـەیدا بـوو: وەك دوو كـەس لـە منداڵێكی نەناسراودا ببێتە كێشەیان‌و هیچێكیان بەڵگەی شـەرعی‌ی نـەبێ (فَـذاكَ) ئـەو گومانە (مَانِعٌ مِنْ إرْثِ النَّشَبِ) قەدەغە كـەرە لـە بـە مـیراتگرتنی مـاڵ لـە هـەردوولاوە، واتە: لە بارەی منداڵەكە میراتگرتن‌و میرات لێگرتنی ڕادەگیرێ تا ئاشكرا دەبێ منداڵی كامەیانە. (وَ) هەروەها (كَوْنُ مَنْ مَاتَ نَبِيّاً مَانِعٌ للإرْثِ) ئەگەر مردووەكە پێغەمبەر بـێ، ئـەوە پێغەمبەرایـەتی قەدەغەكـەری مـیرات لێگرتنـە، چونكـە (وَالْحَدِيـثُ فِيــهِ شَـائِعُ)

وَمَــالُ مَفْقُــودٍ قَضَــــوْا بِوَقْفِـــهِ ٢٣٤ فَـــإِنْ تَقُـــمْ بَيِّنَـــةٌ بِحَتْفِــــهِ
أَوْ حَكَمَ القَـــاضِي بِـــهِ بِـــأَنْ مَضَـــى ٢٣٥ مَـــا غَلَّــبَ الظَّـــنَّ بِأَنَّـــهُ قَضَـــى
أَعْطِـــي مَـــنْ حِينَئِـــذٍ قَـــدْ وَرِثَــــهْ ٢٣٦ لاَمَـــنْ يَحُـــلُّ قَبْـــلَ ذَاكَ جَدَثَـــهْ
هَـــذَا إِذَا مَـــــا ذَكَـــــرَا وَأَطْلَقَـــا ٢٣٧ وَحَيْـــثُ قَيَّـــدَا بِوَقْـــتٍ سَـــبَقَا

---

حەدیسەکەی لەناو حەدیس گێڕەوەکان بڵاوبۆتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَـةٌ﴾ رواه البخاري ومسلم، ئێمە -پێغەمبەران- عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم میراتمان لێ ناگیرێ، هەر شتێکی لە پاش خۆمان بەجێ هێشت دەکرێتە خێر. کەواتە: کە لە ئاخیری زەماندا حەزرەتی (عیسی) پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، میراتی لێ ناگیرێ.

## ﴿هۆیەکانی ڕاگرتنی بەشکردنی میرات چوارن﴾

١- ﴿**هەر کاتێك گومان لە نەژاددا هەبێ**﴾، بەشکردنی میراتەکە ڕادەگیرێ، هەروەك تازە ڕابرا.

## ٢- ﴿مەسەلەی (الْمَفْقُود) گومبوو﴾

واتە: هەر کاتێك گومان لە هەبووندا هەبێ، بەشکردنی میراتەکە ڕادەگیرێ: وەك یەکێك بەدیل بگیرێ، یان گوم ببێو هەواڵی مانو نەمانی نەبێ. جا لەو حاڵەتەدا (وَمَالُ مَفْقُودٍ قَضَـوْا بِوَقْفِـهِ) مـاڵی مرۆڤـی گومبـوو زانایـان بڕیاریـان داوە: ڕابگـیرێو بەسـەر میراتگرەکانیدا بەش نەکرێ تا بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە مردنی ئاشکرا دەکرێ: یان بە شاهیدی دوو پیاو، یان بە بڕیاری قازی، کەوابوو: (فَإِنْ تَقُمْ بَيِّنَةٌ بِحَتْفِه) ئەگەر دوو پیاو شاهیدییان دا: بە مردنی گومبووەکە، (أَوْ حَكَمَ القَاضِي بِهِ) یان قـازی بڕیـاری دا: بـە مردنی گومبووەکە (بِأَنْ مَضَى مَا غَلَّبَ الظَّنَّ) بەو مەرجەی پێش بڕیاردانەکە ماوەیەکی وەها ڕابردبێ: کە گومان بەهێز بکا: (بِأَنَّهُ قَضَى) ئەو گومبـووە مـردووەو لـەو ماوەیـە زیاتر نازیێ، ئینجا کە بە یەکێك لەو دوو ڕێگەیە مردنی ئاشکرا کرا (أَعْطِي مَنْ حِينَئِذٍ قَدْ وَرِثَهُ) ماڵی گومبووەکە بە میرات دەدرێتە ئەو کەسەی لە کاتی بڕیاردانەکـەدا، یـان لە کاتی شـاهیدی دانەکـەدا مـیراتی لێ دەگرێ (لاَمَنْ يَحُلُّ قَبْلَ ذَاكَ جَدَثَـهُ) نـەك ئـەو کەسەی پێش بڕیاردانەکە، یان پێش شاهیدی دانەکە دەمرێو دەچێتە ناو گۆڕەکەی.

**ئینجا بزانـە:** (هَـذَا) ئـەوەی ڕابـرا (إِذَا مَـا ذَكَرَا وَأَطْلَقَـا) لـەو کاتـەدا بـوو: کـە قـازیو شاهیدەکان تەنها باسی مردنەکەی بکەنو هیچ کاتێکیش بۆ مردنەکەی دیـاری نەکـەن،

حُسبَ ذاكَ الزَّمَنُ الْمَحْدُودُ ٢٣٨ وَلَوْ قَضَى مَنْ يَرِثُ الْمَفْقُودُ
وُقِفَ سَهْمُهُ تَمَامُ الْمَالِ ٢٣٩ أَوْ بَعْضُهُ إِلَى بَيَانِ الْحَالِ
وَحَاضِرٌ فِي حَقِّهِ يُعْتَدُّ ٢٤٠ بِأَسْوَإِ الأَحْوَالِ كَيْفَ يَبْدُو
فَمَنْ بِهِ يَصِيرُ ذَا حِرْمَانِ ٢٤١ لَمْ نُعْطِهِ شَيْئاً إِلَى البَيَانِ
مِثْلُ أَخٍ كَانَ لِغَيْرِ وَالِدَةْ ٢٤٢ فَقِدْ مَعَ عَمٍّ وَزَوْجِ الْهَامِدَةْ

---

بەڵام (وَحَيْثُ قَيَّدَا بِوَقْتٍ سَبَقَا) ئەگەر قازی، یان شاهیدەکان کاتێکی ڕابراویان بۆ مردنەکە دیاری کرد، واتە: گوتیان بە ماوەی ئەوەندە پێش ئێستا مردوە، ئەوە لەو حاڵەتەدا (حُسبَ ذَاكَ الزَّمَنُ الْمَحْدُودُ) کاتە دیار کراوەکە حیساب دەکرێ‌و بۆ میراتگرتن‌و بڕیارەکانی تر ڕەچاو دەکرێ، کەواتە: هەر کەسێك لەو کاتە دیارکراوە ڕابراوەدا میراتی لیٚ دەگرت ئەوە میراتەکەی دەدرێتێ، جا ئەگەر ئێستا میراتگرەکە بەخۆی نەمابێ، ئەوە بەشە میراتەکەی وی دەدرێتە میراتگرەکانی.
**ئینجا بزانە:** تا ئێرە باسی گومبوونی میراتدەرەکە بوو، ئێستاش باسی گومبوونی میراتگرەکە دەکەین، کەوابوو: (وَلَوْ قَضَى مَنْ يَرِثُ الْمَفْقُودُ) ئەگەر کەسێکی وەها مرد: کە گومبووەکە میراتی لیٚ دەگرت‌و بەهیچ ڕێگەیەکیش مردنی گومبووەکە ئاشکرا نەکرابوو، ئەوە (وُقِفَ سَهْمُهُ) بەشە میراتی گومبووەکە ڕادەگیرێ: جا (تَمَامُ الْمَالِ أَوْ بَعْضُهُ) بەشەکەی وی هەموو میراتەکە بێ، یان بەشێکی میراتەکە بێ (إِلَى بَيَانِ الْحَالِ) تا حاڵی گومبووەکە ڕوون دەبێتەوە، هەم (وَحَاضِرٌ فِي حَقِّهِ يُعْتَدُّ بِأَسْوَإِ الأَحْوَالِ) دەرهەق میراتگری حازریش بە خراپترین حاڵەت ڕەفتار دەکرێ: (كَيْفَ يَبْدُو) چۆن خراپترەکە دیار بێ، ئەوها، کەواتە: لێرەدا سێ حاڵەت هەیە.
**حاڵەتی یەکەم:** (فَمَنْ بِهِ يَصِيرُ ذَا حِرْمَانِ) هەر میراتگرێك بە هۆی گومبووەکە بێ بەش ببێ، ئەوە (لَمْ نُعْطِهِ شَيْئاً إِلَى البَيَانِ) ئێستا هیچی نادەینێ تا حاڵی گومبووەکە ئاشکرا دەبێ: (مِثْلُ أَخٍ كَانَ لِغَيْرِ وَالِدَةٍ فَقِدَ) وەك برایەکی گومبووی لە دایکی‌و باوکی‌و (مَعَ عَمٍّ وَزَوْجِ الْهَامِدَةْ) لەگەڵ مامێك‌و مێردی ژنە مردووەکە، مەسەلەکە لە دووە، چونکە لە حاڵەتی مردن‌و زیندووەتی گومبووەکەدا: نیوەیی –کە یەکە– بۆ مێردەکەیە‌و، نیوەکەی تریش ڕادەگیرێ: ئەگەر ئاشکرا بوو: لە کاتی مردنی میراتدەرەکەدا برایەکە زیندوو بووە، ئەوە گشت نیوەکە بۆ ئەوە‌و، مامەکە بێ بەشە، وە ئەگەر لە کاتی مردنی میراتدەرەکە برایەکەش مردوو بووبێ، ئەوە نیوەکە گشتی بۆ مامەکەیە.

وَمَـنْ بِمَـوْتٍ أَوْ حَيَـــاةٍ حَقُّــــهُ ٢٤٣ لَـــمْ يَخْتَلِــفْ وُفِّـــــيَ مُسْـــتَحَقَّهُ
كَالزَّوْجِ وَالْبِنْـــتِ مَـعَ ابْـنٍ فُقِـدَا ٢٤٤ وَمَـــنْ نَصِيبُـــهُ بِعَيْـــشٍ أَوْرَدَى
مُنَقَّـــــصٌ تُقَـــدَّرُ الْحَيَــــاةُ ٢٤٥ فِـي حَقِّـــهِ أَوْ قُـــدِّرَ الْوَفَــــاةُ
كَـــالْجَدِّ مَـــعْ أَخٍ شَـــقِيقٍ وَأَخٍ ٢٤٦ فُقِـدَ عَـــنْ وَالِـــدَةٍ مُنْفَســـخِ
فِـــي حَـــقِّ جَـــدٍّ قُـــدِّرَتْ حَيَاتُـــهُ ٢٤٧ وَفِـــي الشَّـــقِيقِ قُـــدِّرَتْ وَفَاتُـــهُ

---

**حاڵەتی دووەم:** (وَمَنْ بِمَوْتٍ أَوْ حَيَاةٍ حَقُّهُ لَمْ يَخْتَلِـفْ) هـەر مـیراتگرێك بـەهۆی مردنـی، یـان زیندووەتـی گومبووەکـە بەشـە مـیراتی نـەگۆڕێ، ئـەوە (وُفِّـيَ مُسْـتَحَقُّهُ) بەشـە میراتەکەی خۆی بە تـەواوی دەدرێتێ: (كَالزَّوْجِ وَالْبِنْتِ مَعَ ابنٍ فُقِدَا) وەکـو مـێردو کـیژو کوڕێکـی گومبـوو، مەسـەلەکە لـە چوارە، چونکـــە لـــە حاڵـــەتی مـــردن‌و زیندووەتـــی گومبووەکەدا مێردەکە چوارێکی هەیە –کە یەکە– بەشەکەی نـاگۆڕێ، بـەڵام دەرهـەق کیژەکەش وەها خرابترە کوڕەکە زیندوو بـێ، کـەوابوو: لـەو سـێیەی ماوەتـەوە تـەنها یەکێك دەدرێتە کیژەکە بە (قاعدة)ی ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْـنِ﴾ جا ئەگـەر ئاشـکرا بوو: کوڕەکە لە کاتی مردنی بـاوکی‌دا زینـدوو بـووە، ئـەوە هـەر بـەو (قـاعدة)یـە دووە ڕاگیراوەکەی دەدرێتێ‌و، ئەگەر ئاشکرا بوو: لە کاتی مردنی باوکی‌دا مردوو بـووە، ئـەو –لەو دووانە– یەکێکی تریش بە خاوەن بەشی دەدرێتە کیژەکە، تاکو نیوە میراتی بۆ تـەواو ببـێ‌و، پاشماوەکـەش –ئەگـەر (بَيْـتُ الْمَـالِ) نـەبێ– هـەر بـۆ کیژەکـە ڕەد دەکرێتەوە، هەروەك ڕابرا.

**حاڵـەتی سـێیەم:** (وَمَـنْ نَصِيبُـهُ بِعَيْشٍ أَوْرَدَى مُنَقَّـصٌ) هـەر مـیراتگرێك بـە هـۆی زیندووەتی، یان مردنی گومبووەکە بەشی کەم ببێتەوە، ئەوە (تُقَدَّرُ الْحَيَاةُ فِي حَقِّـهِ) دەرهەقی وی گومبووەکە: یان بە زیندوو دادەندرێ ئەگەر بە زیندووەتـی‌ی بەشـی کـەم ببێتـەوە، (أَوْ قُدِّرَ الْوَفَاةُ) یـان بـە مـردوو دادەنـدرێ ئەگـەر بـە مردنـی‌ی بەشـی کـەم ببێتەوە: (كَالْجَدِّ مَعَ أَخٍ شَقِيقٍ وَأَخٍ فُقِدَ عَنْ وَالِدَةٍ مُنْفَسِخٍ) وەك باپیرەو برایەکی لە دایکی‌و بـاوکی‌و برایـەکی گومبـووی تـەنها لـە بـاوکی، لێرەدا پێویسـتە دوو مەسـەلە دروست بکرێن لەبەر ئەوەی (فِي حَقِّ جَدٍّ قُدِّرَتْ حَيَاتُهُ) دەرهەق باپیرە گومبووەکە بە زیندووداندراوە، چونکە وەهـا خرابـترە گومبووەکـە لـە دژی وی بژمـێردرێ، جا لەبـەر ئەوەی لێرەدا سێیەك‌و هاوبەشی بۆ باپیرە یەکسانن، مەسەلەی زیندووەتی‌ی لە سێیە –کەبەشی باپیرەی لێ دەردەچێ– (وَفِي الشَّقِيقِ قُدِّرَتْ وَفَاتُهُ) دەرهەق برایەکەش برا

گومبووەکە بەمردوو دندراوە، چونکە وەها خراپترە باپیرە هاوبەشی لەگەڵ برا حازرەکە بکاو تەنها نیوەی بدرێتێ، بۆیێ مەسەلەی مردنیشی لە دووە –کە بەشی برایەکەی لێ دەردەچێ– کەواتە: لێرەدا مەسەلەیەکی زیندووەتیو مەسەلەیەکی مردن دروست بوون:

جا لەبەر ئەوەی هەردوو مەسەلەکان (مُتَبایِن)ن تێکنەکەرەوەنو بەسەر یەکتریدا بەش نابن، بۆیێ یەکێکیان لەوی تر دەدەینو لە شەش ساغ دەبنەوە، جا بەم مەسەلە سێیەمە دەگوترێ: (الْجَامعَة)، واتە: کۆکەرەوەی هەردوو مەسەلەکان. ئینجا دەڵێین: باپیرە لە مەسەلەی زیندووەتی سێیەکی هەبوو، کەوابوو: لە کۆکەرەوەکەش سێیەکی دەدرێتێ –کە دووە– برایەکەش لە مەسەلەی مردن نیوەی هەبوو، کەوابوو: لە کۆکەرەوەکەش نیوەی دەدرێتێ –کە سێیە–، ئینجا یەکێك دەمێنێتەوە –کە شەشێکە– جا ئەگەر ئاشکرا بوو: برا گومبووەکە لە کاتی مردنی میراتدەرەکەدا مردوو بووە، ئەوە شەشێکەکە بۆ باپیرەیە، تاکو وەکو برایەکە نیوە ببا بە هاوبەشی، وە ئەگەر ئاشکرا بوو: لەکاتی مردنی میراتدەرەکەدا برا گومبووەکە زیندوو بووە، ئەوە شەشێکەکەش دەدرێتە برای لە دایکیو باوکیو، برا گومبووەکەش بێ بەش دەبێ، چونکە ئەو تەنها لە باوکییە، بەڵام برایەکە لە دژی باپیرە لەگەڵ خۆیدا ژماردبووی.

﴿**ئاگاداری**﴾ **یەکەم:** ئەوەی ڕابردوو وێنەی ئەوە بوو: کە مەسەلەکانی مردنو زیندووەتی (مُتَبایِن) بن، بەڵام ئەگەر مەسەلەکان (مُتَوَافِق) بوون، ئەو کاتە (وِفْق)ی یەکێکیان لەوی تر دەدرێو مەسەلە سێیەمەکەی کۆکەرەوە دروست دەبێ، وە ئەگەر (مُتَداخِل) بوون، ئەو کاتە زۆرترەکە بە کۆکەرەوە دادەندرێ.

**دووەم:** ئەو بەشە میراتەی بۆ گومبووەکە ڕاگیراوە –ئەگەر بفەوتێ– لەسەر گشت میراتگرەکان حساب دەکرێ، کەواتە: هەر کاتێك گومبووەکە هاتەوە، واتە: ئاشکرا بوو: لە کاتی مردنی میراتدەرەکەدا زیندوو بووە، ئەوە واجبە: سەر لە نوێ لە بەشی هەموو میراتگرەکان –بە گوێرەی میراتەکەیان– بەشە میراتەکەی بۆ دابندرێتەوەو، هەم لە گشت بەرووبومو زێدەییەکانی میراتەکەش دەبێتە هاوبەش، بەڵام ئەگەر گومبووەکە نەگەڕاوەو بە هۆی شاهید، یان بە بڕیاری قازی ئاشکرا کرا: کە لە کاتی مردنی میراتدەرەکەدا مردبوو، ئەوە بەشە میراتەکەی گومبووەکەش دەدرێتەوە میراتگرەکانی مردووەکەی یەکەم، واتە: میراتگرەکانی گومبووەکە هیچ مافێکیان لەو بەشەدا نیە، چونکە دەگونجێ گومبووەکە پێش میراتدەرەکەی مردبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

وَإِنْ يُخلِّــفْ مَــنْ حَــواهُ الجَـــدَثُ ٢٤٨ حَمْــلاً يَحُــوزُ الإِرْثَ أَوْ قَــدْ يَــرِثُ
فِــي حَقِّــهِ وَحَــقِّ غَــيْرِه عُمِـــلْ ٢٤٩ بِمَــا هُــوَ اليَقِــينُ قَبْــلَ يَنْفَصِـــلْ
إِنْ كَانَ ذُوْ الإرْثِ هُوَ الْحَمْـــلَ فَقَــطْ ٢٥٠ أَوْ كَــانَ ثَــمَّ مَــنْ لأَجْلِــهِ سَـــقَطْ
أَوْ مَنْ عَلَى بَعْضِ التَّقَـــادِيرِ احْتَجَــبْ ٢٥١ بِــهِ: كَحَمْــلِ مَيِّــتٍ وَفَـــرْعِ أَبْ
أَوْ مَنْ بِهِ لَيْـــسَ عَــنِ الإرْثِ يُصَـــدّْ ٢٥٢ وَمَالَـــهُ مُقَـــدَّرٌ: مِثْـــلُ الوَلَـــدْ

---

## ٣- ﴿مەسەلەكانى (الْحَمْل) كۆرپەی ناو زگ﴾

واتە: هەر كاتێك گومان لە كۆرپەی نـاو زگدا هـەبێ، بەشكردنی میراتەكە ڕادەگـیرێ، كەوابوو: (وَإِنْ يُخَلِّفْ مَنْ حَواهُ الجَدَثُ حَمْلاً) ئەگەر ئەو مردووەی گۆڕ لەناوخۆی گرتـوە كۆرپەیەكی ناو زگـی بـەجێ هێشـت: كـە (يَحُوزُ الإرْثَ) كۆرپـەكـە لـە گشـت حالـەتێكدا میراتی دەگرت –ئەگەر بە زیندوویی لە دایكی جیا بووباوە–: وەك ژنی خۆی بە ئاوسی لە پاش بەجێ بمێنێ (أَوْ قَدْ يَرِثُ) یـان هـەندێ جـار مـیراتی دەگرتو هـەندێ جاریش میراتی نەدەگرت: وەك ژنە برایەكی ئاوسی لە پاش بەجێ بمێنێ، ئەوە ئەگەر كۆرپەكە نێرینە بێ: میرات دەگرێو، ئەگەر مێیینە بـێ: مـیرات نـاگرێ، ئـەوە (فِـي حَقِّـهِ وَحَـقِّ غَيْرِه) دەرهەق كۆرپەكەو دەرهەق میراتگرەكانی تری جگە لە كۆرپەكە (عُمِـلَ بِمَـا هُـوَ اليَقِينُ) بە ڕێگەی بێگومانی ڕەفتار دەكرێ بۆ پارێزكاری كـردن (قَبْـلَ يَنْفَصِـلَ) پێـش ئەوەی كۆرپەكە لە دایكی جیا ببێتەوە.

ئینجا ڕوونكردنەوەی ڕێگەی بێگومانی لە مەسەلەی كۆیلەدا ئەمەیە: (إِنْ كَـانَ ذُوُ الإرْثِ هُوَ الْحَمْلَ فَقَطْ) ئەگەر خاوەن میراتەكە تەنها كۆیلە بوو، واتە: جگە لـە كۆرپەكـە هیـچ میراتگرێكی تر نەبوو (أَوْ كَانَ ثَمَّ مَنْ لأَجْلِه سَقَطْ) یان جگە لـە كۆرپەكـە مـیراتگری تـر هەبوو، بەڵام بە هۆی كۆرپەكە بێ بەش دەبوو: وەك خوشكو برای تەنها لە دایكی: كە بە هۆی كۆرپەی مردووەكە بێ بەش دەبن، جا كۆرپەكە نێر بـێ، یـان مـێ بـێ (أَوْ مَـنْ عَلَى بَعْضِ التَّقَادِيرِ احْتَجَبْ بِهِ) یان میراتگرێكی وەها هەبوو: كە بە حالـەتێك بـێ بـەش دەبووو بە حالـەتێكی تـر بـێ بـەش نـەدەبوو (كَحَمْـلِ مَيِّـتٍ وَفَـرْعِ أَب) وەكو كۆرپـەی مردووەكەو خوشكو برایەكانی لە دایكیو باوكی، یان تـەنها لە باوكی: ئەگـەر كۆرپـەكـە نێر بێ: ئەوان بێ بەش دەبن، ئەگەر مێ بێ: بێ بەش نابن (أَوْ مَنْ بِـهِ لَيْـسَ عَـنِ الإرْثِ يُصَدُّ) یان میراتگری وەها هەبوو: كە بە هۆی كۆرپەكە بێ بەش نەدەبوو، بەڵام (وَمَالَهُ مُقَدَّرٌ) بەشێكی دیار كراوی نەبوو (مِثْلُ الوَلَدْ) وەكو كوڕو كیژەكـانی مردووەكـە لەگـەڵ

فَفِـي جَمِيعِــــهَا جَمِيـــعُ مَالِـــهِ ٢٥٣ يُجْعَــلُ مَوْقُوفــاً إِلَـــى انْفِصالِــهِ

هذَا هُوَ الْقَــوْلُ الصَّحِيــحُ الأَحْــوَطُ ٢٥٤ فَــإِنَّ أَقْصَــى الْحَمْــلِ لاَ يَنْضَبِـــطُ

أَوْ مَـــنْ لَــــهُ مُقَــدَّرٌ فَيُؤْتَـــى ٢٥٥ ذَلِــــكَ عَـــــائِلاً إِذَا تَـــــأَتَّى

كَــأَبَوَيْنِ مَـــعَ عِــرْسٍ حَـــامِلٍ ٢٥٦ ذِي وَأَبٌ مِثَــالُ غَــيْرِ العَــائِلِ

---

كۆرپەی مردووەكە. ئەوە (فَفِي جَمِيعِهَا) لە هەر چوار وێنەكانی ڕابـردوودا (جَمِيعُ مَالِـهِ يُجْعَلُ مُوْقُوفاً) گشت ماڵی مردووەكە ڕادەگیرێ (إِلَى انْفِصالِـهِ) تـا كۆرپەكـە لـە دایكـی جیا دەبێتەوە (هذَا) ئەو ڕاگرتنە (هُوَ الْقَوْلُ الصَّحِيحُ الأَحْوَطُ) فەرموودەكەی ڕاستو بە پارێزكارترە (فَإِنَّ أَقْصَى الْحَمْلِ لاَ يَنْضَبِطُ) چونكـە ژمـارەی زۆرتریـنی كۆرپـەكانی نـاو زگ بە بێگومانی نازاندرێ، كەواتە: هەرچەند ئێستا ئامێری وەها هەیە: كە ژمارەو نێرو مێیایەتی كۆرپەكە ئاشكرا دەكا، بەڵام بۆیـێ میراتەكـە ڕادەگـیرێ، چونكـە –جگـە لـە خوا– كەسی تر نازانێ: ئەو كۆرپەیە بە زیندوویـی لـە دایكـی جیـا دەبێتـەوە، یـان بـە مردوویی، واتە: مەسەلەی مردنو ژینی كۆرپەكەش وەكو گومبووی بێ هەواڵە، وَاللهُ أَعْلَمُ.

(أَوْ مَنْ لَهُ مُقَدَّرٌ) یان ئەگەر –جگە لە كۆرپەكە– میراتگری وەها هـەبوو: كـە كۆرپەكـە بێ بەشی نەدەكردو بەشی دیار كراویشی هەبوو، ئەوە (فَيُؤْتَى ذَلِكَ عـائِلاً) بەشـە دیـار كراوەكەی –بە (عوْل) كراوی– دەدرێتێ (إِذَا تَأَتَّى) ئەگەر (عوْل) بگونجێ (كَـأَبَوَيْنِ مَـعَ عِرْسٍ حَامِلٍ) وەك دایكو باوكو ژنێكی ئاوسـی لـە پـاش بـەجێ بمێنـێ، مەسـەلەكە لـە بیستو چوارە بە لێدانی (وِفق)ی بەشی ژنەكە لە بەشی دایكەكە، بەڵام بـۆ پارێزكـاری (عَوْل) دەكرێ بۆ بیستو حەفت، نەوەك كۆرپەكە دوو كیژ، یان زیاتر بن: هەشتێكی –سێیە– بۆ ژنەكەو، دایكو باوكیش هەر یەكەو شەشـێكێكیان هەیـە –كـە هـەردووكیان دەكەنە هەشت– شانزەش دەمێنێتـەوەو ڕادەگـیرێ، ئەگـەر كۆرپەكـە: دوو كیـژ، یـان زیاتر بوون، ئەوە گشتی بۆ ئەوانە، وە ئەگەر كۆرپەكە كوڕێـك، یـان زیـاتر، یـان كـوڕو كیـژ بـوون، ئـەو كاتـە بەشـی ژنەكـەو دایكـو بـاوك بـەبێ (عَـوْل) تـەواو دەكـرێو، پاشماوەكەش بۆ منداڵەكانە، بەڵام ئەگەر تەنها كیژێك بێ، ئـەوە نیـوەی بـەبێ (عَـوْل) دەدرێتێ.

**ئینجا بزانە:** بەو مەسەلەیە دەگوترێ: (الْمِنْبَرِيَّـة)، چونكـە ئیمـامی (علـی) ﷺ لەسـەر مینبەری مزگەوت ووتاری دەداو ئەو مەسەلەیان لێ پرسـیو بـە (عَـوْل) كـراوی وەڵامـی دایەوە، دیسان بزانە: ئەگەر –لەو مەسەلەیەدا– كۆرپەكە بە مردوویـی لـە دایكـی جیـا

وَإِنَّمَـــا يَـــرِثُ ذَا إِنِ انْفَصَـــــلْ ٢٥٧ حَيّـاً لِوَقْـتٍ ظُـنَّ أَنَّــهُ حَصَــــلْ
فِـي حَـال مَـوْت مُــــورِث، وَإِلاَّ ٢٥٨ فَلَيْــسَ لِـلإِرْث يَكُـــونُ أَهْـــلاً
وَمُشْــكِلُ الْحَــال إِذَا لَــمْ يَخْتَلِــفْ ٢٥٩ مِيرَاثُـــهُ كَوَلَـــدِ الأُمِّ صُــــرِفْ

---

ببێتەوە، ئەو کاتە مەسەلەکە دەبێتە یـەکێکی (الْغَرَّاوَیْـن)، کەواتـە: دایکەکـە سـێیەکی پاشماوەکەی دەدرێتێ، بەڵام ئەگـەر لـەو مەسـەلەیەدا: دایـك نـەبێ، واتـە: تەنـها (ذي وأَبٌ) ژنە ئاوسەکەو بـاوك هـەبن، ئـەوە (مِثَـالُ غَيْرِ العَائِل) وێنـەی مەسـەلەی (عَوْل) نەکراوە، چونکـە ناگونجـێ، واتـە: هـەر لـە بیسـتو چوارە: هەشتێکی -سێیە- بۆ ژنەکـەو شەشێکی چوارە بۆ باوکەکـەو، حـەقدەش دەمێنێتـەوەو ڕادەگیرێ: ئەگـەر کۆرپەکە کوڕێك، یان زیاتر، یان کوڕو کیژ بوون، ئەوە گشتی بۆ ئەوانە، وە ئەگـەر دوو کیـژ، یـان زیـاتر بـوون دوو سێیەکیان دەدرێتـێو، ئەگـەر تەنـها کیژێـك بـوو نیـوەی دەدرێتـێو، پاشماوەکەی هەردوو حاڵەتیش بۆ باوکەکەیە بە (عَصَبَة)یی.

(وَإِنَّمَا يَرِثُ ذَا) کۆرپــەی نـاو زگ بـەو مەرجـە مـیرات دەگـرێ (إِنِ انْفَصَلَ حَيّـاً) ئەگـەر هەمووی بە زیندوویی لە دایکی جیا ببێتەوەو بێگومان گیـانی جێگـیر بـووی تێـدا بـێ: وەك گریان، یان باوشکان، یان جولاندنی ئەندامێك (لِوَقْتٍ) جیابوونەوەیشی لە کاتێکی وەها بێ: کە (ظُنَّ أَنَّهُ حَصَلَ فِي حَـالِ مَـوْتِ مُـورِثٍ) بزانـدرێ: ئـەم کۆرپەیـە لـە کـاتی مردنی میراتدەرەکەدا لە ناو زگدا هەبووە: وەك لە مردنــی میراتدەرەکـەوە چوار سـاڵ کەمتر بڕواو منداڵەکە ببێ بەو مەرجەی ژنە ئاوسەکە مێردێکی تر سەرجێیی نەکردبێ، یـان شـەش مـانگ کـەمتر بـڕواو منداڵەکـە ببـێ هەرچـەند مـێردێکی تریـش سـەرجێیی کردبێ، واتە: بەو مەرجانــە منداڵەکـە مـیرات دەگـرێ (وَإِلاَّ) بـەڵام ئەگـەر کۆرپەکـە بـە مردوویی لە دایکی جیابۆوە، یان بەشێکی لاشەی نەهاتبووە دەرەوەو مرد، یان گیـانی جێگیر بووی تێـدا نـەبوو، یـان نـەزاندرا لـە کـاتی مردنـی میراتدەرەکـەدا لـە نـاو زگـدا هەبووە، ئەوە (فَلَيْسَ لِلإِرْثِ يَكُـونُ أَهْـلاً) کۆرپەکـە میرات نـاگرێ، چونکـە لـە حاڵـەتی یەکەمو دووەمو سێیەمدا بە نەبوو دادەندرێو، لـە چوارەمیشـدا بێگومـان لـە نـەژادی مردووەکە نیە.

## ٤- ﴿مەسەلەی (الخُنْثَى) نێرامۆك﴾

واتە: هەر کاتێك گومان لە نێرایەتیدا هەبێ، بەشکردنی میراتەکـە ڕادەگـیرێ، کـەوابوو: (وَمُشْكِلُ الْحَالِ) نێرامۆکی نا ئاشکرا: وەك ئەندامی نێرو مێی وێکـڕا هـەبن، یـان تەنـها

إِلَيْــه ممَّـــا ذُو الوَفَـــاة خَلَّـــى ٢٦٠ جَميــــعَ مَـــا اسْـــــتَحقَّهُ، وَإِلاَّ
فَـــازَ بِـــأَخْذ الْقَـــــدر الْمُسْـــتيْقِن ٢٦١ ووُقِـــفَ الْبَـــاقي إِلَـــى التَّبَيُّـــن
وحيْـــثُ كَـــانَ معَـــهُ سِـــوَاهُ ٢٦٢ نُعْطِيــهِ أَيْضــاً مَـــا تحقَّقْنَـــاهُ
ففــي أَخٍ ووَلــدِ خُنْثــى صُـــــرِفْ ٢٦٣ اَلنِّصْــفُ لِلْوَلَــدِ وَالبَــاقِي وُقِــــفْ
وفــى إِبْنَــةِ وولَــدِ خُنْثــى وعَـــمْ ٢٦٤ الثُّلُثـــان بالسَّـــوِيَّة انْقَســـــمْ

---

كونێكى هەبێو ميزى لێ بێتــە دەرەوە، ئـەوە (إِذَا لَـمْ يَخْتَلِـفْ مِيرَاثُـهُ) ئەگـەر بـە نـێرو مێيايەتى ميراتى نەگۆڕێ: (كَوَلَدِ الأُمِّ) وەك منداڵێكى تەنها لە دايكى: خوشك بــێ، يان برا بێ، هەر شەشێكى هەيە (صُرِفَ إِلَيْهِ مِمَّا ذُو الوَفَاة خَلَّـى جَمِيعَ مَـا اسْتَحَقَّهُ) بەشـە دياركراوەكەى خۆى لە ميراتى مردووەكە بـە تـەواوى دەدرێتـێ (وَإِلاَّ) بـەڵام ئەگـەر بـە نێرو مێيايەتى ميراتى دەگۆڕا، ئەوە (فَازَ بِـأَخْذِ الْقَدرِ الْمُسْتَيْقِنِ) بەشـە بێگومانەكـەى خۆى وەردەگرێو (وَوُقِفَ البَاقِي إِلَى التَّبَيُّنِ) ئەو بەشەش كە گومانى تێدايە ڕادەگـيرێ تا نێرايەتى، يان مێيايەتى نێرامۆكەكە ئاشكرا دەبێ: بە هۆى حەيز، يان (مَنى) هــاتن، يان بە حەز بۆچوونى پياوان، يان ئافرەتان، يــان بـە خەبـەردانى خـۆى، بـەڵام ڕيشو مەمك هاتنو جياوازى ژمـارەى پەراسووەكان نابێتـە نيشـانە، هـەروەك لـە (مغنـى)دا فەرموويەتى (وَحَيْثُ كَانَ مَعَهُ سِوَاهُ) هــەر كـاتێك نێرامۆكەكـە جگەلـە خـۆى مـيراتگرى تريشى لەگەڵدا بوو، ئەوە (نُعْطِيهِ أَيْضاً مَا تَحَقَّقْنَاهُ) ميراتگرەكەش بەشە بێگومانەكەى دەدرێتــێو بەگومانەكەشــى ڕادەگـيرێ. ئەمانـــەش چــەند وێنەيــەكى ڕەفتـــار كردنــى بێگومانن.

**يەكـەم:** (فَفِي أَخٍ وَوَلَدِ خُنْثَى) لـە مەسـەلەى برايـەكو منداڵێكـى نـێرامۆك: دەرهــەق برايەكە بە كوڕ دادەندرێو، دەرهەقى خۆى بە كيژ دادەندرێ، كەوابوو: مەســەلەكە لــە دووە -كـە نيـوەى لێ دەردەچـێ- چونكـە بێگومـان (صُرِفَ اَلنِّصْفُ لِلْوَلَد) نيــوەى ميراتەكە بۆ نێرامۆكەكە سەرف دەكرێو (وَالبَـاقِي وُقِـف) نيوەكـەى تريش ڕادەگـيرێ: ئەگەر نێر بوو، ئەوە نيوەكەى تريشى دەدرێتێو برايەكە بێ بەش دەبێ، بــەڵام ئەگــەر مێ بوو، ئەو كاتە نيوەكە بۆ برايەكەيە.

**دووەم:** (وَفِى إِبْنَةٍ وَوَلَدِ خُنْثَى وعَمّ) لە مەســەلەى كيژێكو منداڵێكـى نـێرامۆكو مـامێك: دەرهەق مامەكە بە كـوڕ دادەنـدرێو، دەرهــەقى خـۆى بـە كيـژ دادەنـدرێو، دەرهــەق كيژەكەش هەردوولاى يەكسانە، كەوابوو: مەســەلەكە لـە سـێيە -كـە دوو سـێيەكى لێ

عَلَـى الْفُرَيْعَيْـنِ وبَيْـنَ الْخُنْثَـــى ٢٦٥ وَالعَـمِّ قِـفْ إلَـى البَيَـانِ ثُلْثَـــا
وفـــي حَليـــلٍ وأبٍ وفـــرْعِ ٢٦٦ خُنْثَـى يَفُـــوزُ بَعْلُـــهَا بـــالرُّبْعِ
والأَبُ لِلسُّـــدُسِ ذُو اسْـــتِحْقَاقِ ٢٦٧ وَالنِّصْـفُ لِلْخُنْثَى فَصَـارَ البَـــاقِي
يُوقَــفُ بَيْـــنَ والِـــدٍ وَخُنْثَـــى ٢٦٨ حَتَّـى يَبِـــينَ ذَكَـــراً أَوْ أُنْثَـــى

---

دەردەچێ- چونكە بێگومان (الثُّلُثَانِ بالسَّوِيَّةِ انْقَسَمْ عَلَـى الْفُرَيْعَيْـنِ) دوو سێیەك -كە دووە- بە یەكسانی بەسەر هەردوو منداڵـەكاندا -واتـە: كیژەكـەو نێرامۆكەكـە- بـەش دەكرێو (وبَيْنَ الْخُنْثَى وَالعَمِّ) لە نێوان نێرامۆكەكەو مامەكـەش (قِـفْ إلَـى البَيَـانِ ثُلْثَـا) سێیەكەكەی تر -كە یەكە- ڕابگرە: ئەگەر كوڕ بوو، ئـەوە بـۆ خۆیـەتی بـە (قـاعدة)ی ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾و، ئەگەر مێ بوو، ئەو كاتە بۆ مامەكەیە بە (عَصَبَة)یی.

**سێیەم:** (وَفِي حَلِيلٍ وَأَبٍ وَفَرْعٍ خُنْثَى) لە مەسەلەی مـێردو بـاوكو منداڵێكـی نـێرامۆك، دەرهـەق باوكەكە بە كوڕ دادەنـدرێو، دەرهـەقی خـۆی بـە كیـژ دادەنـدرێو، دەرهـەق مێردەكەش هەردوولای یەكسانە، كەوابوو: مەسەلەكە لە دوانزەیـە بـە لێدانـی (وفْـق)ی بەشی مێردەكە لە بەشی باوكەكە، چونكە (يَفُوزُ بَعْلُهَا بالرُّبْعِ) مێردەكە چوارێكی هەیـە -كە سێیە- (وَالأَبُ لِلسُّدُسِ ذُو اسْتِحْقَاقِ) باوكیشی مافی شەشێكی هەیـە -كـە دووە- (وَالنِّصْفُ لِلْخُنْثَى) نیوەشی -كە شەشە- بۆ نێرامۆكەكەیە (فَصَـارَ البَـاقِي يُوقَـفُ بَيْـنَ وَالِدٍ وَخُنْثَـى) وای لێـهات یـەكێكیش دەمێنێتـەوەو لـە نێـوان باوكەكـەو نێرامۆكەكـەدا ڕادەگیرێ (حَتَّى يَبِينَ ذَكَراً) تا ئاشكرا دەبێ: نێرە، ئەو كاتە بۆ خۆیەتی بە (عَصَبَة)یی (أَوْ أُنْثَى) یان مێیە، ئەو كاتە بۆ باوكەكەیە بە (عَصَبَة)یی.

**ئینجـا بزانـە:** لێرەشـدا -وەكـو مەسـەلەی گومبـوو- حاڵـەتی واهەیـە: دوو مەسـەلە دروست دەكرێن: نێر، مـێ. ئینجا ئەگـەر هـەردوو مەسـەلەكان (مُتَبـاين) بـوون، ئـەوە یەكێكیان لەوی تر دەدرێو، ئەگەر (مُتَوافِق) بوون، ئەوە (وفْق)ی یەكێكیان لە وی تـر دەدرێ، ئینجـا بـەو لێدانانـە گەیشـتنە چـەند، ئـەوە مەسـەلەكەی (الْجَامِعَـة)، واتـە: كۆكـەرەوە دروسـت دەبـێ، بـەڵام ئەگـەر (مُتَداخِـل) بـوون، ئـەو كاتـە زۆرترەكـە بـە كۆكەرەوەكە دادەندرێ، ئینجا لە مەسەلەی كۆكەرەوە: هەر مـیراتگرێك -بـە گوێـرەی زەرەر- بەشە میراتە كەمترەكەی دەدرێتێ، هەروەك لە (الأنوار)دا فەرموویەتی.

**بۆ وێنە:** كوڕێكو منداڵێكی نـێرامۆك: دەرهـەق كوڕەكـە بـە كـوڕ دادەنـدرێ، كـەوابوو: مەسەلەی نێرایەتی‌ی لە دووەو، بێگومـان كوڕەكـە نیـوەی دەدرێتـێ، بـەڵام دەرهـەقی

مَنْ جِهَتَيْ فَرْضٍ وَتَعْصِيبٍ حَوَى ٢٦٩ مِثْلُ ابْنِ عَمٍّ أَوْ كَمُعْتِقٍ هُوا
زَوْجٌ يَحُوزُ بِهِمَا إِرْثَ النَّشَبْ ٢٧٠ لاَ بِنْتُ أُمٍّ هِيَ أُخْتُهَا لأَبْ

---

خۆی به کیژ دادەندرێ، کەوابوو: مەسەلەی مێیایەتیی لە سێیە، چونکە بێگومان نێرامۆکەکە سێیەکی دەدرێتێ، جا لەبەر ئەوەی هەردوو مەسەلەکان (مُتَبَايِن)ن، یەکێکیان لەوی تر دەدەین و مەسەلەکەی (الْجَامِعَة) کۆکەرەوە لە شەش دروست دەبێ: کوڕەکە لە مەسەلەی نێرایەتی نیوەی هەبوو، کەوابوو: لە کۆکەرەوەکەش نیوەی دەدرێتێ —کە سێیە— نێرامۆکەکەش لە مەسەلەی مێیایەتی سێیەکی هەبوو، کەوابوو: لە کۆکەرەوەکەش سێیەکی دەدرێتێ —کە دووە— یەکێکیش دەمێنێتەوە: ئەگەر کوڕ بوو، ئەوە بۆ خۆیەتی تاکو وەکو برایەکەی نیوەیی تەواو ببێ، وە ئەگەر کیژ بوو، ئەو کاتە یەکەکە دەدرێتە کوڕەکە تاکو بەشی ببێتە دوو هەندی کیژەکە.

﴿**ئاگاداری**﴾: ئەگەر نێرامۆکەکە بە نائاشکرایی مردوو ڕوون نەبۆوە ئایا نێرە، یان مێیە؟ ئەوە هیچ چارەمان نیە، تەنها سولح کردن نەبێ: لە نێوان میراتگرەکاندا، واتە: هەندێکیان چاوپۆشی لە بەشی خۆیان بکەن و بەوانی تری ببەخشن، بەڵام لەو حاڵەتەدا بۆ سەرپەرشتکاری شێت و منداڵ دروست نیە: لە ئەندازەی ماف خۆیان کەمتریان بۆ وەربگرێ، هەروەك لە (تحفه)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ﴿میرات گرتن لە دوولاوە﴾

(مَنْ جِهَتَيْ فَرْضٍ وَتَعْصِيبٍ حَوَى) هەر میراتگرێك هەردوولای خاوەن بەشیو میراتگرایەتی پشتێی وێکڕا کۆکردنەوە (مِثْلُ ابْنِ عَمٍّ أَوْ كَمُعْتِقٍ) وەکو کوڕە مامێك، یان ئازادکەرێك: کە (هُوا زَوْجٌ) مێردی ژنە مردووەکە بێ، یان وەکو برایەکی تەنها لە دایکی: کە کوڕە مامی مردووەکە بێ، ئەوە (يَحُوزُ بِهِمَا إِرْثَ النَّشَبِ) بە هەردوولایەکان میراتی ماڵەکە دەگرێ، واتە: مێردەکە نیوەیی بەژن و مێردایەتی و پاشماوەکەش بە میراتگرایەتی پشتێ دەگرێ، برایەکەش شەشێك بە خاوەن بەشیو پاشماوەکەش بە میراتگرایەتی پشتێ دەگرێ، هەروەك لە دوای ئێرە دێ (لاَ بِنْتُ أُمٍّ هِيَ أُخْتُهَا لأَبٍ) نەك وەکو کیژێك کە خوشکی دایکی خۆی بێ تەنها لە باوکی: وەك یەکێك بە هەڵە، یان مەگۆشێك بە مارە برین جیماع لەگەڵ کیژی خۆی بکاو، کیژەکەش لەو جیماعە کیژێکی ببێ، ئەم کیژە بچووکە: هەم کیژی گەورەکەیەو، هەم خوشکی تەنها لە باوکیەتی،

فَإنَّمَا تَرِثُ بِالْبُنُوَّة ٢٧١وَقِيلَ بَلْ بِهَا وَبِالأُخُوَّةْ
أَوْ جِهَتَيْ فَرْضٍ حَوَى فَإنَّمَا ٢٧٢مَدَارُ إرْثِهِ عَلَى أَقْوَاهُمَا
فلَمْ يرِثْ إلاَّ بِهَا وتُدْرَى ٢٧٣بكَوْنِهَا حَاجِبَةً لِلأُخْرَى
بنَقْصٍ أَوْ حِرْمَانِهَا وَإنْ تَرُمْ ٢٧٤مِثَالَهَا: فَكَابْنَةٍ أُخْتٌ لأُمّْ
أَوْ كَوْنِهَا لَمْ تُحْجَبِ عَنِ النَّشَبْ ٢٧٥مِثَالُهَا أُمٌّ هِيَ الأُخْتُ لأَبْ

---

کەوابوو: (فَإنَّمَا تَرِثُ بِالْبُنُوَّة) کیژە بچووکەکە تەنها بە کیژایەتی میرات لە دایکی دەگرێ، چونکە بەهێزترە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ هێزدا: (بَلْ بِهَا وَبِالأُخُوَّة) بەڵکو بە کیژایەتیو بە خوشکایەتی میراتەکە دەگرێ. بەڵام ئەگەر بچووکەکە بمرێ، ئەو کاتە گەورەکە تەنها بە دایکایەتی میرات دەگرێ، نەك بە خوشکایەتی، واتە: چونکە گەورەکەش دایکی بچووکەکەیەو هەم خوشکی لە باوکی‌یەتی، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(أَوْ جِهَتَيْ فَرْضٍ حَوَى) یان میراتگرەکە دوولای خاوەن بەشی‌ی کۆکردنەوە، ئەوە (فَإنَّمَا مَدَارُ إرْثِه عَلَى أَقْوَاهُمَا) خولانەوەی میراتەکەی لەسەر بەهێزترەکەیانە، واتە: (فَلَمْ يَرِثْ إلاَّ بِهَا) تەنها بە بەهێزترەکەیان میرات دەگرێ (وَتُدْرَى) بەهێزترەکەش بە یەکێك لەم سێ کارە دەزاندرێ، **یەکەم:** (بِكَوْنِهَا حَاجِبَةً لِلأُخْرَى) لایەك لایەکەی تر قەدەغە بکا: (بِنَقْصٍ) بە کەمکردنەوەی بەشێکی میراتەکەی (أَوْ حِرْمَانِهَا) یان بە بێ بەشکردنی لە هەموو میراتەکەی (وَإنْ تَرُمْ مِثَالَهَا) ئەگەر داوای وێنەکەی دەکەی: ئەوە (فَكَابْنَةٍ أُخْتٌ لأُمّ) وەکو کیژێك خوشکی تەنها لە دایکی بێ: وەك یەکێك بە هەڵە، یان مەگۆشێك بە مارەکرن جیماع لەگەڵ دایکی خۆی بکاو، دایکەکەش لەم جیماعە کیژێکی ببێ، ئەم کیژە تەنها بە کیژایەتی میرات لە جیماعکەرەکە دەگرێ –نەك بە خوشکایەتی لە دایکی– چونکە لایەنی کیژایەتی لایەنی خوشکایەتی لە دایکی بێ بەش دەکا.

**دووەم:** (أَوْ كَوْنِهَا لَمْ تُحْجَبِ عَنِ النَّشَبْ) یان لایەکە هیچ کاتێك لە میراتی ماڵەکە بێ بەش نەبێ (مِثَالُهَا أُمٌّ هِيَ الأُخْتُ لأَبْ) وێنەکەی: وەکو دایکێك خوشکی لە باوکی بێ: وەك یەکێك بە هەڵە، یان مەگۆشێك بە مارە کردن جیماع لەگەڵ کیژی خۆی بکاو، کیژەکەش لەم جیماعە کیژێکی ببێ، ئەوە کیژە گەورەکە تەنها بە دایکایەتی میرات لەم کیژەی دەگرێ –نەك بە خوشکایەتی لە باوکی– چونکە دایك هیچ کاتێك بێ بەش نابێ.

أَوْ كَوْنِهَا أَقَلَّ فِي التَّحَجُّبِ ٢٧٦ كَأُمِّ أُمٍّ هِيَ أُخْتٌ لأَبِ
وَالْحَجْبُ لِلأَقَلِّ حَجْباً يَحْدُثُ ٢٧٧ فَالْجِهَةُ الأُخْرَى بِهَا يُوَرَّثُ
إِنْ عَاصِبَانِ وَرِثَا مَنْ صُرِعَا ٢٧٨ وَزَادَ وَاحِدٌ بِأَنْ قَدْ جَمَعَا
قَرَابَةً أُخْرَى كَنَجْلَيْ عَمٍّ ٢٧٩ أَحَدُ هَذَيْنِ أَخٌ لأُمٍّ
فَهُوَ عَلَى الأَخِيرِ لَنْ يُقَدَّمَا ٢٨٠ وَلَوْ عَنِ الفَرْضِ بِبِنْتٍ حُرِمَا

---

**سێیەم:** (أَوْ كَوْنِهَا أَقَلَّ فِي التَّحَجُّبِ) یان لایەکە کەمتر بێ بەش ببێ (كَأُمِّ أُمٍّ هِيَ أُخْتٌ لأَبِ) وەکو دایکی دایك خوشکی لە باوکی بێ: وەك بە هەڵە چووەکەی ڕابردوو، یان مەگۆشەکەی ڕابردوو جیماع لەگەڵ ئەم کیژە دووەمەش بکاو، کیژە دووەمەکەش لەم جیماعە منداڵێکی ببێ، ئەوە کیژە گەورەکە دایکی دایکی ئەم منداڵە سێیەمەیەو هەم خوشکی لە باوکیەتی، کەواتە: ئەگەر ئەم منداڵە سێیەمە بمرێ، ئەوە یەکەمەکە بە داپیرایەتی میراتی لێ دەگرێ –نەك بە خوشکایەتی– چونکە داپیرە کەمتر بێ بەش دەبێ. (وَالْحَجْبُ لِلأَقَلِّ حَجْباً يَحْدُثُ) جاری وا هەیە: ئەو لایەی کەمتر بێ بەش دەبوو، بە تەواوی بێ بەش دەبێ، جا ئەو کاتە (فَالْجِهَةُ الأُخْرَى بِهَا يُوَرَّثُ) بە لایە بێ هێزەکە میراتی دەدرێتێ: وەك لەم وێنەی ڕابردوودا منداڵە سێیەمەکە بمرێو، دایكو دایکی دایکی لەپاش بەجێ بمێنێ: لێرەدا لەبەر ئەوەی داپیرە بە دایك بێ بەش بووە، بۆیێ بە خوشکایەتی نیوەی میرات دەگرێ.
(إِنْ عَاصِبَانِ وَرِثَا مَنْ صُرِعَا) ئەگەر دوو (عَصَبَة) میراتگری پشتێ لەیەك پلەدا هاوبەش بوونو، وێکڕا میراتیان لە مردووەکە دەگرت، بەڵام (وَزَادَ وَاحِدٌ) یەکێکیان لەوی تر خزمایەتیی زیاتر بوو (بِأَنْ قَدْ جَمَعَا قَرَابَةً أُخْرَى) وەك لەگەڵ خزمایەتی پشتێ خزمایەتیەکی تریشی کۆکردبێتەوە (كَنَجْلَيْ عَمٍّ) وەکو دوو کوڕە مام (أَحَدُ هَذَيْنِ أَخٌ لأُمٍّ) یەکێکیان برای لە دایکی مردووەکە بێ: وەك بێوەژنێك کوڕێکی هەبێو مێرد بە برای مێردەکەی بکاتەوەو، لەم مێردەشی کوڕێکی ببێو مێردەکەی دووەمیشی کوڕێکی تری لە ژنێکی تر هەبێ، ئینجا کوڕی لە مێردە کۆنەکە بمرێ (فَهُوَ عَلَى الأَخِيرِ لَنْ يُقَدَّمَا) ئەو کوڕە مامەی برای لە دایکیە وەپێش کوڕە مامەکەی تر ناخسترێ، بەڵکو ئەم برا لە دایکیە شەشێکی بە خاوەن بەشی هەیەو پاشماوەکەش بە یەکسانی بۆ هەردووکیانە بە میراتگرایەتی پشتێ. (وَلَوْ عَنِ الفَرْضِ بِبِنْتٍ حُرِمَا) هەرچەند برا لە دایکیەکەش بە هۆی کیژی مردووەکە لە خاوەن بەشی بێ بەش ببێ، هەر وەپێش

وَعَـــدَمُ التَّقْـــدِيمِ خُـــصَّ بِالنَّسَــــبْ ٢٨١ إِذْ فِي الـــوَلاَ تَقْدِيمُـــهُ أَمْــرٌ وَجَـــبْ

هَذا بَيَانُ أُصُولِ المَسَائِلِ وَمَا يَتَعَلَّقُ بِهَا

إِنْ عَصَبَـــات كَــــانَتِ الــــوُرَّاثُ ٢٨٢ وَهُــــمْ ذُكُــــورٌ أَوْ هُــــمْ إِنَــــاثُ

فَمَـــالُ مَــــنْ أَصَابَــــهُ الْمَنِيَّـــةْ ٢٨٣ بَيْنَــــهُمُ يُقْسَــــمُ بِالسَّــــوِيَّةْ

وَقَـــدِّرِ الذَّكَـــرَ أُنْثَيَيْــــنِ ٢٨٤ عِنْــدَ اجْتِمَــاعِ ذَيْنِــكَ الصِّنْفَيْــنِ

وَعَـــدَدُ الــرُّؤُسِ مِنْــهُمْ قِيــلَ لَــــهُ ٢٨٥ فِي عُرْفِ أَهْلِ الفَنِّ: أَصْــلُ الْمَسْــأَلَةْ

---

ئەوی تر ناکەوێ: وەك ئەو دوو کوڕە مامە کیژێکی مردووەکەیان لەگەڵدا بێ، ئەوە کیژەکە نیوەیی هەیەو، پاشماوەکەش بۆ هەردوو کوڕە مامەکەیە بە یەکسانی، چونکە لای برایەتی لە دایکیی بەهۆی کیژەکە بێ بەش بووە (وَعَدَمُ التَّقْدِيمِ خُصَّ بِالنَّسَبْ) ئەم پێش نەخستنە تایبەتە بە نەژاد (إِذْ فِي الوَلاَ تَقْدِيمُهُ أَمْرٌ وَجَبْ) چونکە لە خزمایەتی کۆیلە ئازاد کردندا واجبە: برا لە دایکیی‌یەکە وەپێش ئەوی تر بخسترێ.

**﴿هَذَا بَيَانُ أُصُولِ المَسَائِلِ وَمَا يَتَعَلَّقُ بِهَا : ئەمە ڕوونکردنەوەی دروستکردنی بنچینەی مەسەلەکانە﴾**

(إِنْ عَصَبَاتٍ كَانَتِ الوُرَّاثُ) ئەگەر میراتگرەکان گشتیان (عَصَبَة)، واتە: میراتگری پشتێ بوون‌و هیچ خاوەن بەشێکیان لەگەڵدا نەبوو (وَهُمْ ذُكُورٌ) هەم گشتیشیان نێرینە بوون: وەك سێ کوڕ، یان سێ برا (أَوْ هُمْ إِنَاثُ) یان گشتیان مێیینە بوون: وەك سێ ئافرەت کۆیلەیەکیان ئازاد کردبێ، ئەوە (فَمَالُ مَنْ أَصَابَهُ الْمَنِيَّةْ) ماڵی ئەو کەسەی مردنی تووش بووە (بَيْنَهُمُ يُقْسَمُ بِالسَّوِيَّةْ) بە یەکسانی لە نێوانیاندا بەش دەکرێ. (وَقَدِّرِ الذَّكَرَ أُنْثَيَيْنِ) هەر نێرینەیەك بە دوو مێیینە دابنێ (عِنْدَ اجْتِمَاعِ ذَيْنِكَ الصِّنْفَيْنِ) لە کاتی کۆبوونەوە هەردوو جۆرەکانی نەژاد وێکڕا: وەك خوشك‌و برا، یان کوڕو کیژ، چونکە بە دانانی خوای گەورە: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ نێرینە وەك بەشی دوو مێیینەی هەیە. ئینجا (وَعَدَدُ الرُّؤُسِ مِنْهُمْ) ژمارەی سەری ئەو کەسانەی میراتەکەیان بەسەردابەش دەکرێ (قِيلَ لَهُ فِي عُرْفِ أَهْلِ الفَنِّ) لە زاراوەی میرات زانەکاندا پێی دەگوترێ (أَصْلُ الْمَسْأَلَةْ) بنچینەی مەسەلەکە، بۆ وێنە: کوڕێك‌و کیژێك بنچینەی مەسەلەکەیان لە سێیە. دوو کوڕو کیژێك بنچینەی مەسەلەکەیان لە پێنجە. دوو خوشك‌و برایەك بنچینەی مەسەلەکەیان لە چوارە...بەو جۆرە.

إنْ كَانَ فِي الْوُرَّث مَـــنْ تكُـونُ لَـهْ ٢٨٦ فَرِيضَـــةٌ فَـإنَّ اَصْـــلَ الْمَسْـــئَلَةْ

مَخْرَجُـــهَا وَهُـــوَ أَقَـــلُّ عَـــدَدْ ٢٨٧ يَصِـــحُّ مِنْـــهُ الكَسْـــرُ، أَوْ إنْ يُوجَـــدِ

فِيـــهِمْ ذَوَا فَرْضَيْـــنِ قَـــدْ تَمَـــاثَلاَ ٢٨٨ فِـــي مَخْـــرَجٍ فَـــالأَصْلُ مِنْـــهُ جُعِـــلاَ

كَزَوْجَـــةٍ تُوُفِّيَـــتْ عَـــنْ بَعْـــلِ ٢٨٩ وَالأُخْتِ مِنْ أَصْلَيْـــنِ أَوْ مِـــنْ اَصْـــلِ

وَأَخَـــوَاتٍ أَرْبَـــعٍ حُـــزْنَ النَّشَـــبْ ٢٩٠ ثِنْتَـــانِ مِـــنْ أُمٍّ وَثِنْتَـــانِ لأَبْ

---

(إنْ كَانَ فِي الْوُرَّث مَنْ تَكُونُ لَهُ فَرِيضَةٌ) ئەگەر لە میراتگرەکاندا خاوەن بەشێك هـەبێ، ئەوە (فَإنَّ اَصْلَ الْمَسْئَلَة) بنچینەی مەسەلەکە (مَخْرَجُهَا) لێدەرچووی بەشە میراتەکەیـە (وَهُوَ) لێدەرچووەکە (أَقَلُّ عَدَدٍ يَصِحُّ مِنْهُ الكَسْرُ) کەمترین ژمارەیە: کە ئـەو پارچەیـەی بە ساغی لێ دەردەچێ، مەبەستیش بـە پارچەکـە –لێرەدا– هـەر بەشـە میراتەکەیـە، کەوابوو: لێدەرچووی نیوەیی: ژمارە دووە، چونکە کەمترین ژمارە –کە نیوەیی ساغی هەبێ– ژمارە دووە، هـەروەها لێدەرچـووی سـێیەك: ژمـارە سـێیە، چونکـە کـەمترین ژمـارە –کـە سـێیەکی سـاغی هـەبێ– ژمـارە سـێیە، هـەروەها لێدەرچـووی چوارێـك: چوارەو، لێدەرچووی شەشێك: شەشەو، لێدەرچووی هەشتێك: هەشتە. **ئینجا بزانـە:** وا دەبێ: ئەو ژمارانە زیاتر لە پارچەیەکیان هەیە: وەك ژمارە چوار: نیوەیی‌و چوارێکی هەیـەو، شـەش: نیوەیـی‌و سـێیەك‌و شەشـێکی هەیـەو، هەشـت: نیوەیـی چوارێـك‌و هەشتێکی هەیە، بەڵام بۆ دروسـتکردنی مەسـەلەکان ووردتریـن پارچـە ڕەچـاو دەکرێ هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی.

(أَوْ إنْ يُوجَد فِيهِمْ ذَوَا فَرْضَيْنِ) یان ئەگەر لە میراتگرەکاندا دوو خاوەن بەش هـەبوون: کە (قَدْ تَمَاثَلاَ فِي مَخْرَجٍ) لە لێدەرچووی بەشەکانیاندا هاووێنـە بـوون: وەك دوو نیـوە، یـان دوو سـێیەك، یـان دوو شەشـێك، ئـەو کاتـەش (فَـالأَصْلُ مِنْـهُ جُعِـلاَ) بنچینـەی مەسەلەکە هەر لە لێدەرچووەکە دروست دەکرێ (كَزَوْجَةٍ تُوُفِّيَتْ عَنْ بَعْلٍ وَالأُخْتِ مِنْ أَصْلَيْنِ أَوْ مِنْ اَصْلٍ) وەك ژنێك مردبێ‌و، مێردو خوشکێکی لە دایکی‌و باوکی، یان تەنـها لە باوکی لە پاش بەجێ بمێنێ: دوو نیوەیی تێدایە، کەوابوو: بنچینەکەی لە دووە –کە نیوەی لێ دەردەچێ– نیوە بۆ مێردەکەو، نیوەکەی تریش بۆ خوشکەکە (وَ) هـەروەها وەکو (أَخَوَاتٍ أَرْبَعٍ حُزْنَ النَّشَبْ) چوار خوشك کە گشت میراتەکە دەگرن (ثِنْتَانِ مِنْ أُمٍّ وَثِنْتَانِ لأَبْ) دووانیـان لـەو چوارانـە تەنـها لـە دایکینـەو، دووەکـانی تریش تەنـها لــە باوکینە، ئەوەش سـێیەکێك‌و دوو سـێیەکی تێدایـە، کـەوابوو: بنچینـەی مەسـەلەکە لـە

فَالْمَـالُ أَثْلاَثـاً عَلَيْـــهَا قُســـمَا ٢٩١ أَمَّـــا إِذَا اخْتَلَـــفَ مَخْرَجَاهُمَـــا

فَـــإِنْ يَكُونَـــا مُتَدَاخِلَيْــــن ٢٩٢ إِذْ فَنِــي الأَكْـــثَرُ مَرَّتَيْــــن

فَصَـاعِدًا بِمَـــا هُـــوَ الأَقَـــلُّ ٢٩٣ فَـإِنَّ أَعْلَـى الْمَخْرَجَيْـنِ الأَصْـلُ

كَثُلُـثٍ وَسُـــدُسٍ فِـــي عَـــمٍّ ٢٩٤ وَالأُمِّ وَالأُخْـــتِ الَّتِــــي لأُمِّ

كَذَا إِذَا الْبَاقِي مِـنَ الأَعْلَـى حَصَـلْ ٢٩٥ نَفَـادُهُ فِـي ثُلْـثِ بَـاقٍ بِـالأَقَلّ

---

سێیە —کە سێیەکی لێ دەردەچێ— ئینجا (فَالْمَالُ أَثْلاَثاً عَلَيْهَا قُسِمَا) میراتەکە بە سێ بەشی بەسەر مەسەلەکەدا بەش دەکرێ، واتە: دوو سێیەك بۆ لە باوکیەکانو، سێیەکیش بۆ لە دایکیەکان، بەم شێوەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣، میراتگر ــــــــ | دوو خوشکی لە باوکی، | دوو خوشکی لە دایکی | |
| ١ × بەشە میرات ــــ | دوو سێیەك، | سێیەك | |
| ٣ ÷ ــــــــــ | ٢ + | ١ | = ٣ |

(أَمَّا إِذَا اخْتَلَفَ مَخْرَجَاهُمَا) بەلاّم ئەگەر لە مەسەلەکەدا دوو بەشە میرات هەبوون: کە لێدەرچووەکانیان لێك جیاواز بوون: بە کەمیو بە زۆری، ئەو کاتە هەردووك ژمارەکان: یان (مُتَداخِل)، واتە: تێکڕا چوون، یان (مُتَوافِق)، واتە: تێککەرەوەن، یان (مُتَبايِن)، واتە: ڕێکنەکەوتوون، کەوابوو: (فَإِنْ يَكُونَا مُتَدَاخِلَيْن) ئەگەر هەردووك لێدەرچووەکان (مُتَداخِل)، واتە: تێکڕا چووبوون (إِذْ فَنِي الأَكْثَرُ مَرَّتَيْنِ فَصَاعِداً) چونکە ژمارە زۆرترەکە بە جارێك، یان بە زیاتر لە ناو دەچوو (بِمَا هُوَ الأَقَلُّ) بە لێدەرکردنی ژمارە کەمترەکە، چونکە ژمارە کەمترەکە دەچووە ناو زۆرترەکە، ئەو کاتە (فَإِنَّ أَعْلَى الْمَخْرَجَيْنِ الأَصْلُ) زۆرترینی لێدەرچووەکان بنچینەی مەسەلەکەیە (كَثُلُثٍ وَسُدُسٍ) وەکو سێیەكو شەشێك (فِي عَمٍّ وَالأُمِّ وَالأُخْتِ الَّتِي لأُمِّ) لە مەسەلەی مامو دایكو خوشکێکی تەنها لە دایکیدا: دایك سێیەکی هەیەو، خوشکەکەش شەشێکی هەیە، جا لەبەر ئەوەی شەش بە لێدەرکردنی سێ بە دوو جار لە ناو دەچێ —چونکە سێ دەچێتە ناو شەشو شەش ژمارە زۆرترەکەیە— بۆیێ شەش دەکرێتە بنچینەی مەسەلەکە، چونکە سێیەکیشی تێدایە، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر ــــــــ | دایك، | خوشکی لە دایکی، | مام | |
| ١ × بەشە میرات ــــ | سێیەك، | شەشێك، | پشتێیە | |
| ٦ ÷ ــــــــــ | ٢ + | ١ + | ٣ | = ٦ |

(كَذَا) هەروەها لێدەرچووە زۆرترەکە بە بنچینەی مەسەلەکە دادەندرێ (إِذَا الْبَاقِي مِنَ الأَعْلَى) هەر کاتێك پاشماوەی زۆرترەکە لە دوای دەرکردنی بەشی ژنەکە لە

أَوْ مُتَوَافِقَيْـــنِ إِذْ لَـــمْ يُنْفِـــدِ ٢٩٦ ذَيْنِـكَ إِلاَّ ثَـــالِثٌ مِـــنْ عَـــدَدِ
فَــإِنَّ أَصْلَــهَا هُــوَ الَّــذِي يَجِـــي ٢٩٧ مِنْ ضَرْبِ وِفْقِ مَخْرَجٍ فِـــي مَخْــرَجِ
مِثَالُـــهُ كَسُـــــدُسٍ وَثُمُـــــنِ ٢٩٨ كَمَا فِـــي زَوْجَـــةٍ وَجَـــدٍّ مَـــعَ ابْـــنِ

---

مەسەلەیەکی (الْغَرّاوَيْن)دا (حَصَلَ نَفَادُهُ) لەناو دەچوو -(فِي ثُلْثِ بَاقٍ) لـە مەسـەلەی سێیەکی پاشماوەکە- (بالأَقَلِّ) بە لێدەرکردنی کەمترەکە لە ناو دەچوو: وەك ژنێكو دایـكو بـاوك، مەسـەلەکە لـە چـوارە: چوارێکـی -یەکـە- بـۆ ژنەکـە، سـێیەکی پاشماوەکەش -یەکە- بۆ دایکەکە، پاشماوەکەش بۆ باوکەکە، واتە: ئـەو سێیەی لـە دوای بەشی ژنەکە ماوەتەوە، بە ژمارە سێ لە ناو دەچێ -کە سێیەکی لێ دەردەچێ- بۆیێ لێدەرچووی بەشی ژنەکە -کە چوارە- بە بنچینەی مەسەلەکە داندراوە، چونکـە زۆرترە.

(أَوْ مُتَوَافِقَيْنِ) یان ئەگەر هەردووك لێدەرچووەکان (مُتَوَافِق) تێککـەرەوە بـوون، واتـە: بە بەشێك لە بەشەکانیان تێکیـان دەکـردەوە (إِذْ لَمْ يُنْفِدِ ذَيْنِكَ) چونکـە هیـچ شـتێك ژمارە کەمترەکەو زۆرترەکەی لەناو نـەدەبردن (إلاَّ ثَالِثٌ مِنْ عَدَدٍ) تەنـها لێدەرکردنـی ژمارەیەکی سێیەمین لەناوی دەبردن، ئەو کاتە (فَإِنَّ أَصْلَهَا هُـوَ الَّـذِي يَجِـي) بنچینـەی مەسەلەکە ئەو ژمارەیەیە: کە دروست دەبێ (مِنْ ضَرْبِ وِفْقِ مَخْرَجٍ فِـي مَخْـرَجِ) بـەهۆی لێدانی (وِفْق) واتە: بەشە تێککـەرەوەی لێدەرچـووەك لـە تـەواوی لێدەرچووەکـەی تـر (مِثَالُهُ) وێنەی تێککردنەوە: (كَسُدُسٍ وَثُمُنِ) وەکو شەشێكو هەشـتێك (كَمَا فِـي زَوْجَـةٍ وَجَدٍّ مَعَ ابْنِ) هەروەك لە مەسەلەی ژنێكو باپیرەو کورێکـدا: ژنەکـە هەشـتێکی هەیـەو، باپیرە شەشێکی هەیە، لێدەرچووەکەیان کە شەشو هەشتە (مُتَوَافِق) تێککەرەوەن بە نیوەیـی، واتـە: هـەردووك نیوەیـی سـاغیان هەیـە، چونکـە ئەگـەر شـەش لـە هەشـت دەرکەین دوو دەمێنێتەوە، ئەم دووەش ژمارەیەکی سێیەمینەو شـەشو هەشـت لـەناو دەبـاو هـەم نیوەیشـی لێ دەردەچـێ، کەواتـە: شـەشو هەشـت لـە نیوەییـدا تێـك دەکەنەوەو، نیوەی یەکێکیان لـە تـەواوی ئـەوی تـر دەدرێو بنچینـەی مەسـەلەکە لـە بیستو چوار دروست دەبێ، بەم شێوەیە:

| | ژن، | باپیرە، | کوڕ |
|---|---|---|---|
| ٨، میراتگر | | | |
| ٣ × بەشە میرات | هەشتێك، | شەشێك، | پشتێیە |
| ÷ ٢٤ | ٣ + | ٤ + | ١٧ = ٢٤ |

وَإِنْ يَكُــنْ تَعَــدُّدٌ لِلْوِفْــقِ ٢٩٩ فَإِنَّمَــا الْعِــبْرَةُ بِــالأَدَقِّ
كُــلٌّ تَدَاخُــلٍ لَــهُ تَوَافُــقُ ٣٠٠ مِنْ غَيْرِ عَكْــسٍ وَالْمُــرَادُ الْمُطْلَــقُ
أَوْ مُتَبَــايِنَيْنِ إِذْ لَــمْ يَنْفَــدَا ٣٠١ إِلاَّ بِوَاحِــدٍ وَلَيْــسَ عَــدَدَا
فَــإِنَّ أَصْلَــهَا هُــوَ الَّــذِي يَجِــي ٣٠٢ مِنْ مَخْــرَجٍ تَضْرِبُــهُ فِــي مَخْــرَجِ
كَــالأُمِّ وَالعِــرْسِ وَعَــمٍّ مَــنْ نُعِــي ٣٠٣ فَــإِنَّ فِيــهَا ثُلُثــاً مَــعَ رُبُــعِ

---

(وَإِنْ يَكُنْ تَعَدُّدٌ لِلْوِفْقِ) ئەگەر (وِفْق)ی لێدەرچووەکان لە یەك زیاتر بوو، واتە: هەردووك ژمارەکان بە زیاتر لە پارچەیەك تێکیان دەکردەوە، ئەو کاتە (فَإِنَّمَا الْعِبْرَةُ بِالأَدَقِّ) تەنها ووردترین پارچە ڕەچاو دەکرێ: وەك دوانزە لەگەڵ هەژدە: بە نیوەو، بە سێیەكو، بە شەشێك تێك دەکەنەوە، جا چونکە شەشێك لە گشتیان ووردترە، بۆیێ بۆ دروستکردنو ساغکردنەوەی مەسەلەکان ئەویان ڕەچاو دەکرێ (كُلُّ تَدَاخُلٍ لَهُ تَوَافُقٌ) گشت ژمارەیەکی تێکڕاچوو بە تێککەرەوەش دادەندرێ: وەکو سێ لەگەڵ شەشو نۆ: کەمەکە دەچێتە ناو زۆرەکانو بە سێیەکیش تێك دەکەنەوە، -جا ئاگادار بە: بۆ ساغکردنەوەی مەسەلەکان زۆر پێویستە شارەزای ئەم (قاعدة)یە بی-، بەڵام (مِنْ غَيْرِ عَكْسٍ) بە پێچەوانەوە نیە، واتە: ژمارە تێککەرەوەکان تێکڕاچوو نینە، وەك شەشو هەشت، چونکە مەرجی (مُتَداخِل) تێکڕاچوو ئەمەیە کەمترەکە لە نیوەی زۆرترەکە زیاتر نەبێ (وَالْمُرادُ الْمُطْلَقُ) مەبەست بە تێککردنەوە لێرەدا تێککردنەوەی هەمە لایەنە: کە هاوێنەو، تێکڕاچوو، تێککەرەوە دەگرێتەوە.

(أَوْ مُتَبَايِنَيْنِ) یان ئەگەر هەردووك لێدەرچووەکان (مُتَباين) ڕیکنەکەوتوو بوون، واتە: بە هیچ بەشێکیان تێکیان نەدەکردەوە (إِذْ لَمْ يَنْفَدَا) چونکە ژمارە کەمترەکەو زۆرترەکە بە هیچ شتێك لەناو نەدەچوون (إِلاَّ بِوَاحِدٍ) تەنها بە لێدەرکردنی یەك نەبێ (وَلَيْسَ عَدَداً) یەکیش بەژمارە داناندرێ، ئەو کاتە (فَإِنَّ أَصْلَهَا هُوَ الَّذِي يَجِي) بنچینەی مەسەلەکە ئەو ژمارەیەیە: کە دروست دەبێ (مِنْ مَخْرَجٍ تَضْرِبُهُ فِي مَخْرَجِ) بەهۆی لێدانی تەواوی لێدەرچووەك لە تەواوی لێدەرچووەکەی تر (كَالأُمِّ وَالعِرْسِ وَعَمٍّ مَنْ نُعِي) وەکو دایكو ژنو مامێکی ئەو مردووەی بانگەوازی مردنی کراوە (فَإِنَّ فِيهَا ثُلُثاً) ئەو مەسەلەیە سێیەکێکی تێدایە بۆ دایکەکەو (مَعَ رُبُعِ) لەگەڵ چوارێکێکیش بۆ ژنەکە، سێو چواریش (مُتَباين)ن بە هیچ بەشێکیان تێك ناکەنەوەو، ئەگەر سێ لە چوار دەرکەین یەك دەمێنێتەوە، بەڵام یەك هەردووکیان لەناو دەبا، کەواتە: تەواوی

وَكَالرِّكَابِيَّـةِ وَهِـيَ عِـرسُ ٣٠٤ وَإِخْـوَةٌ لِمَـنْ حَـوَاهُ الرَّمَـسُ
عَدَدُهُـمْ عَشَـرَةٌ وَإِثْنَـان ٣٠٥ وَالِـدَةٌ وَالأُخْـتُ وَابْنَتَـان
فِيـهَا ثَلاَثَـةٌ مَـعَ الثَّمَانِيَّـةْ ٣٠٦ فَتُضْـرَبُ أُولاَهُمَـا فِـي الثَّانِيَـةْ
لَكِنَّـهَا تَصِـحُّ مِـنْ سِـتِّمِأَةْ ٣٠٧ فَاسْـتَكْمَلَتْ سِـهَامَهَا تِلْـكَ الْفِئَـةْ
وَذِيـكَ فِـي عَـهْدِ عَلِـيٍّ وَقَعَـتْ ٣٠٨ ثُـمَّ إِلَـى الْقَـاضِي شُـرَيْح رُفِعَـتْ
وَبَعْـدَ أَنْ جَعَلَـهَا مِـنْ سِـتٍّ ٣٠٩ مِـأَةً أَعْطَـى وَاحِـداً لِلأُخْـتِ

---

يەكێكیان لە تەواوی ئەوی تر دەدرێو، بنچینەی مەسەلەكە لە دوانزە دروست دەبێ، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٤، میراتگر ــــــــ | دایك، | ژن، | مام | |
| ٣ × بەشە میرات ــــــ | سێیەك، | چوارێك، | پشتێیە | |
| ÷ ١٢ ــــــــــ | ٤ + | ٣ + | ٥ | = ١٢ |

(وَكَالرِّكَابِيَّةِ) هەروەها (تَبايُن) وەكو مەسەلەی ڕكێبەكەیە (وَهِـيَ) مەسـەلەی ڕكێبەكـە: (عِرسُ) ژنی مردووەكەیەو (وَإِخْوَةٌ لِمَنْ حَوَاهُ الرَّمَسُ عَدَدُهُمْ عَشَرَةٌ وَإِثْنَانِ) دوانـزە بـرای مردووەكەو (وَالِدَةٌ وَالأُخْتُ وَابْنَتَانِ) دایكو خوشكێكو دوو كیژی مردووەكەنە (فیهَا ثَلاَثَةٌ مَعَ الثَّمَانِيَّـةِ) لـە مەسـەلەكەدا سێ هەیـە كـە دوو سێیەكی كیژەكانی لێ دەردەچێو، هەشـتیش هەیـە ـكـە هەشـتێكی ژنەكـەی لێ دەردەچێ ـ سـێو هەشـت (مُتَبـایِن) ڕێكنەكەوتوون، كەوابوو: (فَتُضْرَبُ أُولاَهُمَا فِي الثَّانِيَةِ) یەكەمەكەیان ـكـە سـێیە ـ لـە دووەكە دەدرێ ـكە هەشتە ـ بنچینەی مەسەلەكە دەگاتە بیستو چوار (لَكِنَّـهَا تَصِحُّ مِنْ سِتِّمِأَةٍ) بەڵام لە شەشسەد ساغ دەبێتەوە، چونكە شـانزە بـۆ كیژەكانـە، چوار بـۆ دایكەكەیە، سێ بۆ ژنەكەیە، بۆ خوشكو برایەكانیش تەنـها یـەك دەمێنێتـەوەو لەگـەڵ ژمارەی سەرەكان ـكە بیستو پێنجـە ـ (مُتَبـایِن) ڕێكنەكـەوتووە، كـەوابوو: ژمـارەی سەرەكان لە بنچینەی مەسەلەكە دەدەین دەگاتە شەشسـەد (فَاسْتَكْمَلَتْ سِهَامَهَا تِلْـكَ الْفِئَةُ) ئەو كۆمەڵە میراتگرە بەشە میراتەكانی خۆیان بە تەواوی گرت: كیژەكـان: چـوار سەد، دایك: سەد، ژنەكە: حەفتاو پێنج، خوشكو برایەكان: بیستو پێنج، واتـە: تەنـها یەكێك بـۆ خوشـكەكەیە. (وَذِيـكَ فِـي عَـهْدِ عَلِـيّ وَقَعَـتْ) ئـەم مەسـەلەیە لـە سـەردەمی (خلافة)ی ئیمامی (علی)دا ڕوویدا (ثُمَّ إِلَى الْقَاضِي شُـرَيْحٍ رُفِعَـتْ) ئینجـا بـۆ لای قـازی (شُرَيْحْ) بەرز كراوە (وَبَعْدَ أَنْ جَعَلَهَا مِنْ سِتِّمِأَةٍ) پاش ئەوەی مەسەلەكەی لە شەشسـەد

فَــأَقْبَلَتْ نَحْـــوَ أَبِـــي تُـــرَاب ٣١٠ وَرِجْلُــهُ إِذْ ذَاكَ فِــــي الرِّكَــــاب
قَالَتْ أَخِـــي مَـــاتَ وَعِنْدَمَــا هَلَــكْ ٣١١ سِـــتَّ مِيَــهْ مِــنَ الدَّنَانِــيرِ تَــــرَكْ
وَلِـــي بِدِينَـــارٍ شُـــرَيْحٌ قَـــدْ حَكَـــمْ ٣١٢ وَقَـــدْ أَتَيْـــتُ اشْـــتَكِي مِمَّــا ظَلَـــمْ
قَـــالَ لَعَـــلَّ حِـــينَ ذَاقَ حَتْفَـــهُ ٣١٣ عَصابَـــةً سِـــوَاكِ خَلَّــــى خَلْفَـــهُ
وَعَدَّهُمْ كَمَـــا مَضَـــى قَـــالَتْ نَعَـــمْ ٣١٤ فَقَـــالَ بِـــالحَقِّ قَضَـــى وَمَـــا ظَلَـــمْ
فَجُمْلَـــةُ الأُصُـــولِ سَـــبْعَةٌ تُـــــرَى ٣١٥ مَخَـــارِجُ الفُـــرُوضِ وَاثْنَـــا عَشَــــرا
وَضِعْفُـــهُ، وَذَاكَ قَـــــوْلُ السَّــــلَفِ ٣١٦ لَكِنَّـــهُ قَـــدْ زَادَ بَعْـــضُ الْخَلَـــفِ

---

ساغ كردەوە (أَعْطَى وَاحِداً لِلأُخْتِ) تەنها یەك دیناری دایە خوشكەكە (فَأَقْبَلَتْ نَحْوَ أَبِي تُرَاب) ئینجا خوشكەكەش ڕووی كردە لای ئیمامی (علی) -بزانە: پێغەمبەر ﷺ جارێك بە ئیمامی (علی)ی گوت: (أَبُو تُراب) بۆیێ خەڵكیش وای پێ دەڵێن- (وَرِجْلُهُ إِذْ ذَاكَ فِي الرِّكَابِ) لەو كاتی خوشكەكە چووە لای ئیمامی علی، پێیەكەی لە ناو ڕكێبی وولاغەكەیدا بوو دەیویست سوار ببێ، جا هەر لەبەر ئەمەش پێی دەگوترێ (الرِّكابِيَّة)، هەم پێی دەگوترێ (الدِّيناريَّــةُ الكُبْرَى) چونكە خوشكەكە تەنها دینارێكی وەرگرت (قَالَتْ) خوشكەكە گوتی (أَخِي مَاتَ) برایەكەم مردوە (وَعِنْدَمَا هَلَكَ سِتَّ مِيَهْ مِنَ الدَّنَانِيرِ تَرَكَ) كە مرد شەشسەد دیناری لە پاش خۆی بەجێ هێشت (وَلِي بِدِينَارٍ شُرَيْحٌ قَدْ حَكَمْ) قازی (شُرَيحْ) تەنها یەك دیناری بۆ من بڕیار داوە (وَقَدْ أَتَيْتُ اَشْتَكِي مِمَّا ظَلَمْ) هاتومە لای تۆ شكایەتی ئەو ستەمەی لێ دەكەم (قَالَ) ئیمامی (علی) لە وەڵامدا فەرمووی: (لَعَلَّ حِينَ ذَاقَ حَتْفَهُ) لەوانەیە كە برایەكەت مردوە (عَصابَةً سِوَاكِ خَلَّى خَلْفَهُ) كۆمەڵە میراتگرێكی تری -جگە لە تۆ- لە دوای خۆی بەجێ هێشتبێ (وَعَدَّهُمْ كَمَا مَضَى) ئیمامی علی میراتگرەكانی ژماردن: وەك ڕابرا (قَالَتْ نَعَمْ) خوشكەكەش گوتی: بەڵێ، ئەوەندە میراتگرە بووین (فَقَالَ بِالحَقِّ قَضَى وَمَا ظَلَمْ) ئیمامی علی فەرمووی: قازی (شُرَيح) بە ڕاستی بڕیارەكەی داوەو، ستەمی لە تۆ نەكردوە.

(فَجُمْلَةُ الأُصُولِ سَبْعَةٌ) كۆی بنچینەكانی ئەو مەسەلانەی بەشە میراتەكانیان لێ دەچن: حەفتن (تُرَى مَخَارِجُ الفُرُوضِ) دەناسرێن: كە هەر پێنج لێدەرچووەكانی بەشە میراتەكانن: دوو، سێ، چوار، شەش، هەشت، هەم (وَاثْنَا عَشَرا) دوانزەو، هەم (وَضِعْفُهُ) دوو هەندی دوانزەش: كە بیستو چوارە، جا ئەو بنچینانەش: یان لە

أَصْلَيْــنِ آخَرَيْــنِ ضِعْــفَ التِّسْـــعَةْ ٣١٧وَضِعْــفَ ضِعْفِــهَا فَصَــارَتْ تِسْـــعَةْ
فَــأَوَّلٌ كَمَـــــنْ يَحُــــلُّ رَمْسَـــــهْ ٣١٨عَـــنْ إِخْـوَةٍ لِغَـــــيْرِ أُمٍّ خَمْسَــــــةْ
وَالْجَــدِّ مَــعْ وَالِــــدَةٍ.وَالثَّــانِي ٣١٩جَـدٌّ وَسَــبْعَةٌ مِــنَ الإِخْـــوَانِ
لِغَـــيْرِ أُمٍّ زَوْجَـــــةٌ وَوَالِـــــدَةْ ٣٢٠هَذَا الأَصَـــحُّ فَــهُوَ طِبْــقُ القَــاعِدَةْ

اَلْعَوْلُ

ثُــمَّ نَقُـــولُ هَـــذِهِ الأُصُـــولُ ٣٢١ثَلاَثَـــةٌ مِـــنْ بَيْنِـــهَا تَعُـــولُ

---

بەشێکی بە تەنها دروست دەبن، یان لە دوو بەشی: هاوێنە، یان تێکڕاچوو، یان تێککەرەوە، یان ڕێکنەکەوتوو، هەروەك ڕابرا (وَذَاكَ قَوْلُ السَّلَفِ) کورتکردنەوەی بنچینەکان لەو حەفتەدا فەرموودەی زانایانی پێشینەیە، (لَكِنَّهُ قَدْ زَادَ بَعْضُ الْخَلَفِ أَصْلَيْنِ آخَرَيْنِ) بەڵام چەند زانایەکی لە دوای ئەوان دوو بنچینەی تریان زیاد کردووە: لە مەسەلەکانی باپیرەو برایەکاندا، **یەکەم:** (ضِعْفَ التِّسْعَةِ) دوو هەندی نۆ: کە هەژدەیە. **دووەم:** (وَضِعْفَ ضِعْفِهَا) دوو هەندی دوو هەندەکەش: کە سیو شەشە (فَصَارَتْ تِسْعَةً) کەوابوو: بنچینەکان بوونە نۆ.

(فَأَوَّلٌ) بنچینەی یەکەمیان: کە هەژدەیە (كَمَنْ يَحُلُّ رَمْسَهُ) وەك کەسێك بمریو بچێتە ناو گۆڕەکەی (عَنْ إِخْوَةٍ لِغَيْرِ أُمّ خَمْسَةٍ وَالْجَدِّ مَعَ وَالِدَةٍ) پێنج براو باپیرەو دایکی لە پاش بەجێ بمێنێ، چونکە کەمترین ژمارە کە شەشێكو سێیەکی پاشماوەکەی هەبێ: هەژدەیە. (وَالثَّانِي) بنچینەکەی دووەمیش: کە سیو شەشە (جَدٌّ وَسَبْعَةٌ مِنَ الإِخْوَانِ لِغَيْرِ أُمّ زَوْجَةٌ وَوَالِدَةٌ) باپیرەو حەفت براو ژنێكو دایك، چونکە کەمترین ژمارە کە چوارێكو شەشێكو سێیەکی پاشماوەکەی هەبێ: سیو شەشە (هَذَا الأَصَحُّ) ئەوە فەرموودەی هەڵبژاردراوو ڕاسترە (فَهُوَ طِبْقُ القَاعِدَةْ) چونکە لەگەڵ (قاعدة)ی ژمارە تێك دەکاتەوە، کەواتە: هەژدە بنچینەی گشت مەسەلەیەکە: کە شەشێكو سێیەکی پاشماوەکەی تێدایە، هەروەها سیو شەش بنچینەی گشت مەسەلەیەکە: کە چوارێكو، شەشێكو سێیەکی پاشماوەکەی تێدایە، هەروەك لە شەرحەکەیدا فەرموویەتی.

## ﴿الْعَوْلُ: باسی (عَوْل)ی مەسەلەکان﴾

**پێناسە:** (عَوْل) زێدە کردنێکە لە ژمارەی بەشە میراتەکانداو کەم کردنێکە لە ئەندازەی بەشی میراتگرەکاندا. (ثُمَّ نَقُولُ هَذِهِ الأُصُولُ) ئینجا دەڵێین: ئەو بنچینانەی

لأَنَّ أَجْـــزَاءَ الْفُـــرُوضِ تَقَـــعُ ٣٢٢ زَائِـــدَةً فَـــهِيَ إِلَيْـــهَا تُرْفَـــعُ
لَكِنْ يَعُمُّ كُـــلَّ مَـــنْ فِـــي الْمَسْـــأَلَةْ ٣٢٣ نَقْصٌ عَلَى حَسَـــبِ مَـــا جُعِـــلَ لَـــهْ
فَـــالأَوَّلُ السِّـــتَّةُ قَـــدْ عَـــالَتْ إِلَـــى ٣٢٤ عَشَـــرَةٍ شَـــفْعاً وَوَتْـــراً بِـــالوِلاَ
مِثَـــالُ سَـــبْعَةٍ إِلَيْـــهَا الْعَـــوْلُ ٣٢٥ أُخْتَـــانِ فَرْعَـــا وَالِـــدٍ وَبَعْـــلُ

---

ڕابردوو (ثَلاَثَةٌ منْ بَيْنها تَعُولُ) سێیان لەوان (عَوْل) دەکرێن: شەش و، دوانزەو، بیست و چوار. (لأَنَّ أَجْزَاءَ الْفُرُوضِ تَقَعُ زَائِدَةً) چونکە بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاتر دەبن، کەواتە: (فَهِيَ إِلَيْهَا تُرْفَعُ) مەسەلەکە بۆ ئەو بەشانە بەرز دەکرێتەوە (لَكِنْ يَعُمُّ كُلَّ مَنْ فِي الْمَسْأَلَة نَقْصٌ) بەڵام بەهۆی (عَوْل) گشت میراتگرێك لە مەسەلەکەدا کەمبوونەوەیەکی بەشەکەی دەیگرێتەوە (عَلَى حَسَبِ مَا جُعِلَ لَهُ) بە گوێرەی ئەو بەشەی بۆی داندراوە، واتە: بەشەکەی لە چەند یەك پێکهاتبێ، ئەوە هەر یەکێك بە نیسبەتی (عَوْل) پێکراوەکە لێی کەم دەبێتەوە، بۆ وێنە: ئەگەر شەش (عَوْل) بکرێ بۆ حەفت، ئەوە هەر یەکێك لەو شەش یەکانەی ژمارە شەشیان لێ پێك دێ بە ئەندازەی حەفتێکێك لێی کەم دەبێتەوە ئینجا بە (إجماع)ی (صحابة)کان لە سەردەمی ئیمامی (عمر) بە ئاماژەی ئیمامی (عباس)ﷺ ئەو (عَوْل) کردنە داندرا، هەروەك لە (تحفە)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(**فَالأَوَّلُ**) **بنچینەی یەکەم:** (السِّتَّةُ) شەشە (قَدْ عَالَتْ إِلَى عَشَرَةٍ) چوار جار (عَوْل) دەکرێ تا دەگاتە دە (شَفْعاً وَوَتْراً بِالوِلاَ) بە جووت و بە تاك بە دوای یەکدا (مِثَالُ سَبْعَةٍ إِلَيْهَا الْعَوْلُ) وێنەی (عَوْل) کردن بۆ حەفت: (أُخْتَانِ فَرْعَا وَالِدٍ وَبَعْلُ) دوو خوشکی لە باوکیو مێرد: مێردەکە نیوەی هەیە –کە سێیە– خوشکەکانیش دوو سێیەکیان هەیە –کە چوارە– جا لەبەر ئەوەی کۆی بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترە، بۆیێ بە شەشێکی مەسەلەکە (عَوْل) دەکرێ بۆ حەفت، کەواتە: شەشێکێك زیاد کراوە بەڵام هەر شەشێکێکیش حەفتێکێکی لێ کەم بۆتەوە، واتە: مێردەکە سێ شەشێکی هەیەو سێ حەفتێکی لێ کەم بۆتەوە، خوشکەکانیش چوار شەشێکیان هەیەو چوار حەفتێکیان لێ کەم بۆتەوە –هەروەك لە (البجیرمی)دا ڕوون کراوەتەوە– ئەمەش شێوەی (عَوْل) کردنەکەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣، میراتگر | مێرد، | دوو خوشك | |
| ٢× بەشە میرات | نیوە، | دوو سێیەك | |
| ÷٦ | ٣ + | ٣ شەشێکی کەمە | |
| +١ (عَوْل) بە شەشێکی مەسەلەکە | | | |
| ÷٧ | ٣ + | ٤ | = ٧ |

أَمَّا مِثَالُ الْعَوْلِ لِلثَّمَانِيَةْ ٣٢٦ فَهَؤُلاَءِ مَعَ أُمِّ الفَانِيَةْ
وَالعَوْلُ لِلْتِّسْعَةِ مِثْلُ هَؤُلاَ ٣٢٧ مَعَ أَخٍ لِلأُمِّ، وَالعَوْلُ إِلَى
عَشَرَةٍ كَهَؤُلاَءِ الْجَمّ ٣٢٨ مَعَ أَخٍ آخَرَ فَرْعِ الأُمِّ
وَالثَّانِي ضِعْفُ سِتَّةٍ وَتَجْرِي ٣٢٩ ثَلاَثُ عَوْلاَتٍ لَهُ بَالوَتْرِ
عَالَتْ إِلَى ثَلاَثَةٍ وَعَشَرَةْ ٣٣٠ أُخْتَانِ لاَ لِلأُمِّ أُمٌّ وَمَرَةْ

---

(أَمَّا مِثَالُ العَوْلِ للثَّمَانِيَةِ) بەڵام وێنەی (عَوْل) بۆ هەشت: (فَهَؤُلاَءِ مَعَ أُمِّ الفَانِيَةِ) ئەو سێ میراتگرانەو لەگەڵ دایکی ژنە مردووەکە: مێردەکە نیوەی هەیەو، خوشکەکانیش دوو سێیەکیان هەیەو، دایکەکەش شەشێکی هەیە -کە یەکە- جا بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترن بۆیێ بە سێیەکی مەسەلەکە (عَوْل) دەکرێ بۆ هەشت، سێیەکێك زیاد دەبێو، هەر یەکێکیش هەشتێکێکی لێ کەم دەبێتەوە -وەك ڕوونمان کردەوە- (وَالعَوْلُ للتِّسْعَة) وێنەی (عَوْل) بۆ نۆ: (مِثْلُ هَؤُلاَ مَعَ أَخٍ للأُمِّ) وەکو ئەو چوار میراتگرانەو برایەکی لە دایکی: مێرد نیوەی هەیەو، خوشکەکان دوو سێیەکیان هەیەو، دایکەکە شەشێکی هەیەو، برایەکەش شەشێکێکی تری هەیە، بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترن، بۆیێ بە نیوەی مەسەلەکە (عَوْل) دەکرێ بۆ نۆو، هەر یەکێك نۆیەکێکی لێ کەم دەبێتەوە (وَالعَوْلُ إِلَى عَشَرَةٍ) وێنەی (عَوْل) بۆ دە: (كَهَؤُلاَءِ الْجَمِّ مَعَ أَخٍ آخَرَ فَرْعِ الأُمِّ) وەکو ئەو پێنج میراتگرانەو برایەکی تری لە دایکی، نیوە بۆ مێردەکەو دوو سێیەك بۆ خوشکەکانو، شەشێك بۆ دایکەکەو، سێیەك بۆ هەردوو برایەکانی لە دایکی، بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترن بۆیێ بە دوو سێیەکی مەسەلەکە (عَوْل) دەکرێ بۆ دەو، هەر یەکێکیش دەیەکێکی لێ کەم دەبێتەوە.

(**وَالثَّانِي**) **بنچینەی دووەم:** (ضِعْفُ سِتَّةٍ) دوو هەندی شەشە: کە دوانزەیە (وَتَجْرِي ثَلاَثُ عَوْلاَتٍ لَهُ بِالوَتْرِ) سێ جار (عَوْل) دەکرێ بە تاك تا دەگاتە حەڤدە (عَالَتْ إِلَى ثَلاَثَةٍ وَعَشَرَةْ) جارێك (عَوْل) دەکرێ بۆ سێزدە: وەك (أُخْتَانِ لاَ لِلأُمِّ أُمٌّ وَمَرَةْ) دوو خوشکی لە دایکیو باوکیو دایكو ژنێك: خوشکەکان دوو سێیەکیان هەیە -کە هەشتە- دایك شەشێکی هەیە -کە دووە- ژنەکەش چوارێکی هەیە -کە سێیە- بەشە میراتەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترن، بۆیێ بە نیوەی شەشێك (عَوْل) دەکرێ بۆ سێزدە.

وَعَالَ ثَانِياً بِمِثْلِ الرُّبُعِ ٣٣١ كَالأَخِ مِنْ أُمٍّ وَتِلْكَ الأَرْبَعِ
وَعَالَ ثَالِثاً لِسَبْعَةَ عَشَرْ ٣٣٢ كَفَرْعِ أُمٍّ وَأُولاَئِكَ النَّفَرْ
وَجُعِلَتْ كَهَذِهِ الْمَسْئَلَةِ ٣٣٣ أُمُّ الأَرَامِلِ الشَّهِيرَةِ الَّتِي
بِهَا مِنَ الإِنَاثِ سَبْعَ عَشْرَةْ ٣٣٤ أَصْنَافُهَا أَرْبَعَةٌ مُشْتَهَرَةْ
ثَلاَثُ زَوْجَاتٍ وَجَدَّتَانِ ٣٣٥ وَأَخَوَاتٌ لأَبٍ ثَمَانِ
وَأَخَوَاتٌ أَرْبَعٌ مِنْ وَالِدَةْ ٣٣٦ فَوَاحِدٌ حِصَّةُ كُلِّ وَاحِدَةْ
ثَالِثُ مَا يَعُولُ ضِعْفُ اثْنَيْ عَشَرْ ٣٣٧ وَعَوْلُهُ بِثُمْنِهِ قَدِ اسْتَقَرّْ

---

(وَعالَ ثَانِياً بِمِثْلِ الرُّبُعِ) جاری دووەمیش بە وێنەی چوارێك (عَوْل) دەكریّ بۆ پانزە (كَالأَخِ مِنْ أُمّ وَتِلْكَ الأَرْبَعِ) وەك برایەكی لە دایكیو ئەو چوار میراتگرانەی ڕابردوو: دوو سێیەك بۆ خوشكەكانو شەشێك بۆ دایكو، چوارێك بۆ ژنەكەو برایەكەش شەشێكی هەیە –كە دووە– كەوابوو: (عَوْل) دەكریّ بۆ پانزە. (وَعالَ ثَالِثاً لِسَبْعَةَ عَشَرْ) جاری سیّیەمیش (عَوْل) دەكریّ بۆ حەڤدە (كَفَرْعِ أُمّ وَأُولاَئِكَ النَّفَرِ) وەك برایەكی تری لە دایكیو ئەو پێنج میراتگرانەی ڕابردوو، دوو سێیەك بۆ خوشكەكانو، شەشێك بۆ دایكو، چوارێك بۆ ژنەكەو، سێیەكێكیش –كە چوارە– بۆ هەردوو برایەكان، كەوابوو: بە چوارێكو شەشێكی مەسەلەكە (عَوْل) دەكریّ بۆ حەڤدە.
(وَجُعِلَتْ كَهَذِهِ الْمَسْئَلَةِ أُمُّ الأَرَامِلِ) مەسەلەكەی (أُمُّ الأَرَامِلِ)ش وەك ئەو مەسەلەی ڕابردوو داندراوە: كە (عَوْل) دەكریّ بۆ حەڤدە (الشَّهِيرَةِ الَّتِي بِهَا مِنَ الإِنَاثِ سَبْعَ عَشْرَةْ) كە مەشهورەو حەڤدە ئافرەتی تێدایە (أَصْنَافُهَا أَرْبَعَةٌ مُشْتَهَرَةٌ) جۆرەكانی ئەو ئافرەتانە چوارنو مەشهورن: كە (ثَلاَثُ زَوْجَاتٍ وَجَدَّتَانِ وَأَخَوَاتٌ لأَبٍ ثَمَانِ وَأَخَوَاتٌ أَرْبَعٌ مِنْ وَالِدَةٍ) سیّ ژنو دوو داپیرەو هەشت خوشكی لە باوكیو چوار خوشكی لە دایكی، لە دوانزەوە (عَوْل) دەكریّ بۆ حەڤدە: هەرسێك ژنەكان چوارێكیان هەیە –كە سیّیە– هەردووك داپیرەكان شەشێكیان هەیە –كە دووە– هەشت خوشكەكانی لە باوكی دوو سێیەكیان هەیە –كە هەشتە– چوار خوشكەكانی لە دایكی سێیەكێكیان هەیە –كە چوارە– كەوابوو: (فَوَاحِدٌ حِصَّةُ كُلِّ وَاحِدَةٍ) هەر یەكێك بەشی ئافرەتێكە، بۆیێ بە (الدِّينَارِيَّةُ الصُّغْرَى)ش ناودەبریّ.
(**ثَالِثُ مَا يَعُولُ**) **بنچینەی سیّیەم:** كە (عَوْل) دەكریّ: (ضِعْفُ اثْنَيْ عَشَرَ) دوو هەندی دوانزەیە: كە بیستو چوارە (وَعَوْلُهُ بِثُمْنِهِ قَدِ اسْتَقَرَّ) تەنها جارێك (عَوْل) كردنی بە

كَرَجُلٍ مَـاتَ عَـنِ ابْنَتَيْـنِ ٣٣٨ وَعَـنْ حَلِيلَـةٍ مَـعَ الأَصْلَيْـنِ

هَذا بَيانُ تَصْحِيحِ الْمَسَائِلِ

فَـرْعٌ: إِذَا سِـهَامُهُمْ تَنْقَسِـمُ ٣٣٩ مِـنْ أَصْـلِ مَسْـئَلَتِهِمْ عَلَيْـهِمُ

---

هەشتێکی خۆی جێگیر بووە بۆ بیستو حەفت (كَرَجُلٍ مَاتَ عَنِ ابْنَتَيْـنِ وَعَنْ حَلِيلَـةٍ مَـعَ الأَصْلَيْنِ) وەك پیاوێك بمرێو دوو کیژو ژنێكو دایكو باوکی لەپاش بەجێ بمێنێ -کە پێی دەگوترا (الْمِنْبَرِيَّة)- کیژەکان دوو سێیەکیان هەیە -کە شانزەیە- ژنەکە هەشتێکی هەیە -کە سێیە- دایك شەشێکێکی هەیە -کە چوارە- باوکیش شەشێکێکی هەیە -کە چوارە- جا چونکە بەشەکان لە بنچینەی مەسەلەکە زیاترن بۆیێ بە هەشتێکی مەسەلەکە (عَوْل) دەکرێ بۆ بیستو حەفت، بەم شێوەیە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر ــــــ | دوو کیژ، | باوك، | دایك، | ژن | |
| ٤ × بەشە میرات ــــ | دوو سێیەك، | شەشێك، | شەشێك، | هەشتێك | |
| ٢٤ ÷ ــــــ | ١٦ + | ٤ + | ٤ + | هەشتێکی کەمە | |
| ٣ + ــــ | (عَوْل) بە هەشتێکی مەسەلەکە | | | | |
| ٢٧ ÷ ــــــ | ١٦ + | ٤ + | ٤ + | ٣ | = ٢٧ |

﴿فَرْعٌ فِي بَيَانِ تَصْحِيحِ الْمَسَائِلِ: لقێك لە باسی ساغكردنەوەی مەسەلەکان﴾

**پێشەکەی بزانە:** (أُصُول الْمَسَائِل)، واتە: دروستکردنی بنچینەی مەسەلەکان -بەو چوار حاڵەتانەی ڕابردوو- ڕێخۆشکەرێك بوو بۆ (تَصْحِيح الْمَسَائِل)، واتە: ساغكردنەوەی مەسەلەکان. **دیسان بزانە:** (أُصُول المَسائِل) بنچینەی مەسەلەکان بە لێدانی (مَخْرَج) لە (مَخْرَج) دروست دەبێ -واتە: لێدانی لێدەرچووی بەشە میراتێك لە لێدەرچووی بەشە میراتێکی تر- بەڵام (تَصْحِيح المَسائِل) ساغكردنەوەی مەسەلەکان بە لێدانی (الْمُنْكَسِر عَلَيْهِم) دەبێ -واتە: لێدانی ژمارەی ئەو سەرانەی بەشەکانیان بەسەردا دەشکێتەوە- تاکو بە ساغی بەسەریاندا بەش ببێ، هەروەك لە (البجيرمي)دا فەرموویەتی، **ئینجا بزانە:** لێرەشدا -وەك بەشکردنی میرات- ئەگەر کوڕو کیژ، یان خوشكو برا وێکڕا کۆبوونەوە، ئەوە بۆ ساغكردنەوەی مەسەلەکە هەر نێرینەیەك بە دوو مێیینە دەژمێردرێ.

**دیسان بزانە:** جاری وا هەیە: مەسەلەکە هەر لە بنچینەی خۆی ساغ دەبێتەوەو، جاری واش هەیە: بۆ ساغكردنەوە پێویستی بەو لێدانەی داهاتوو هەیە. کەوابوو: (إِذَا سِهَامُهُمْ تَنْقَسِمُ) هەر کاتێك زانیت بنچینەی مەسەلەکە لە چەندەو، بەشە میراتەکانیش بەساغی

فَـذَاكَ لِلْعَمَـــــلِ غَــيْرُ مُفْتَقِــرْ ٣٤٠ وَإنْ عَلَــى عَــدَد صِنْــفٍ تَنْكَســـرْ
ضُــرِبَ إنْ تَبَايَنَــا فِــي الْمَسْــــأَلَةْ ٣٤١ بعَوْلِــهَا حَيْــثُ تَكُـــونُ عَائِلَـــةْ
فَـــــأَخَوَانِ لأَبٍ وَبَعْــــــــلُ ٣٤٢ مِثَــالُ مَــا يَفْقِــدُ فِيــــهِ الْعَــوْلُ

---

بەش دەبــوون (مِـنْ أَصْـلِ مَسْـئَلَتِهِمْ عَلَيْـهِمْ) بەسـەر میراتگرەکـاندا، هـەر لـە بنچینـەی مەسەلەکەی خۆیان، چونکە ژمارەی میراتگرەکان لەگەڵ بەشەکانیان (مُتَماثِل) هاوویّنە بوون، یان (مُتَداخِل) تێکڕاچوو بوون، واتە: ژمارەی سەری میراتگرەکـان دەچـووە نـاو ژمـارەی بەشـەکانیان (فَـذَاكَ لِلْعَمَـلِ غَـيْرُ مُفْتَقِرٍ) ئـەوە پێویسـتی بـە هیـچ کـارێکی سـاغکردنەوە نیـە، چونکـە بەشـەکان بەسـاغی بـەش دەبـن: وەك مـێردو سـێ کـوڕ، بنچینەی مەسەلەکە لە چوارە –کە بەشی مێردەکەی لێ دەردەچێ–: چوارێك –یەکە– بۆ مێردەکەو، پاشماوەکەش –سێیە– بۆ سێ کوڕەکە، هەم وەکـو ژنێـكو سـێ کـوڕو کیژێك، مەسەلەکە لە هەشتە –کە بەشی ژنەکەی لێ دەردەچێ–: هەشـتێکی –یەکـە– بـۆ ژنەکـەو، پاشماوەکـەش –حەفتـە– بـۆ کیـژو کوڕەکـان: هـەر کوڕێـك دوو هـــەندی کیژەکە.

بەڵام (وَإِنْ عَلَى عَدَدِ صِنْفٍ تَنْكَسِرْ) ئەگەر بەشە میراتەکان بەسەر ژمارەی یـەك جـۆرە میراتگردا دەشکاوە، واتە: میراتگرەکان یـەك جـۆر بـوونو بەشـە میراتەکـەیان بەسـەر دابـەش نـەدەبوو، ئـەوە بەشـە میراتەکـەیان بەرامبـەر ژمـارەی سـەرەکانیان دەکـرێ: جیاوازی نیە میراتگری پشتێ بن، یـان خـاوەن بـەش بـن. ئینجـا کـە تەماشـا دەکـەین ژمارەی سـەری میراتگرەکـانو بەشـەکانیان: یـان (مُتَبـايِن)ن، یـان (مُتَوافِـق)ن، واتـە: چونکە ئەگەر (مُتَماثِل)، یـان (مُتَداخِـل) بـن، ئـەو کاتـە بەشـەکانیان ناشـکێنەوەو بـە ساغی بەسەریاندا بـەش دەبـن، هـەروەك تـازە ڕابـرا، ئینجـا لـە دوای بەرامبـەر کـردن (ضُرِبَ إِنْ تَبَايَنَا فِـي الْمَسْأَلَةِ) ئەگـەر ژمـارەی سـەری میراتگرەکـانی جۆرەکـە لەگـەڵ بەشەکانیان (مُتَبايِن) ڕێکنەکەوتوو بوون، ئەوە ژمارەی میراتگرەکانی جۆرەکە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێ (بِعَوْلِهَا حَيْثُ تَكُـونُ عَائِلَـةً) بـە (عَـوْل)ەوە ئەگەر (عَوْل) کراو بـێ، یـان بـێ (عَـوْل) ئەگـەر (عَـوْل) نـەکراو بـێ، ئینجـا بـەو لێدانـە گەیشتە کام ژمارە، ئەوە لەو ژمارەیە مەسەلەکە ساغ دەبێتەوە.

١– (فَأَخَوَانِ لأَبٍ وَبَعْلُ) دوو برای لە باوکیو مێرد (مِثَالُ مَا يَفْقِدُ فيهِ الْعَوْلُ) وێنەی ئەو (تَبـايُن)ەیـە کـە (عَـوْل)ی نـەبێ: چونـکە بنچینـەی مەسـەلەکە لـە دووە –کـە بەشـی

وَأَخَـــــوَاتٌ لأَبٍ أَوْ كَامِلَـــــــةْ ٣٤٣ خَمْسٌ مَـــعَ الــزَّوْجِ مِثَــالُ العَائِلَــةْ
وَإِنْ تَوَافَقَـــا فَوِفْقُــــهُ ضُـــــرِبْ ٣٤٤ فِيــهَا وَلَـــوْ بِعَوْلِــهَا ثُــمَّ حُســـبْ

---

مێردەکەی لێ دەردەچێ-: نیوەی -یەکە- بۆ مێردەکەو، پاشماوەکەش -یەکـە- بـۆ دوو برایەکەیەو بەسەریاندا بەش نابێ، ژمارەی برایەکان لەگەڵ بەشەکەیان (مُتَباين)ن، بۆیێ ژمارەی دوو برایەکان دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لـە تـەواوی مەسەلەکە دەدرێو، لـە چوار ساغ دەبێتەوە: دوو بۆ مێردەکەو، دوو بۆ برایەکان، بەم شێوەیە:

٢، میراتگر ______ مێرد، دوو برا
١ × بەشە میرات _____ نیوە، پشتێیە
٢ ÷ ______ ١ + ١ بەسەر دوودا بەش نابێ
٢ × _____ ساغکردنەوە بە دوو برا
٤ ÷ ______ ٢ + ٢ = ٤

٢- (وَأَخَوَاتٌ لأَبٍ أَوْ كَامِلَةٌ خَمْسٌ مَعَ الزَّوْجِ) پێنج خوشکی لـە بـاوکی، یـان لـە دایکـیو باوکی لەگەڵ مێرد (مِثَالُ العَائِلَة) وێنەی (عَوْل) کراوەکەیە، چونکە بنچینەی مەسەلەکە لە شەشە بە لێدانی دوو لە سێ -کە بەشـی مێردەکـەو خوشـکەکانی لێ دەردەچـێ- ئینجا (عَوْل) دەکرێ بۆ حەفت، چونکە نیوەی -سێیە- بـۆ مێردەکـەو، دوو سـێیەکی چوارە بـۆ پێنـج خوشـکەکانو بەسـەریاندا بـەش نابـێو، ژمـارەی خوشـکەکان لەگـەڵ بەشەکەیان (مُتَبـاين)ن، بۆیـێ ژمـارەی پێنـج خوشـکەکان دەبێتـە (جُزْءُ السَّهْم)و لـە مەسەلە (عَوْل) کراوەکە دەدرێو لە سیو پێنج ساغ دەبێتـەوە: پـانزە بـۆ مێردەکـەو، بیست بۆ خوشکەکان، بەم شێوەیە:

٣، میراتگر ______ مێرد، پێنج خوشك
٢ × بەشە میرات _____ نیوە، دوو سێیەك
٦ ÷ ______ ٣ + ٣، شەشێکی کەمە
١ + _____ (عَوْل) بە شەشێك
٧ ÷ ______ ٣ + ٤، بەسەر پێنجدا بەش نابێ
٥ × _____ ساغ کردنەوە بە پێنج خوشك
٣٥ ÷ ______ ١٥ + ٢٠ = ٣٥

(وَإِنْ تَوَافَقَا) ئەگـەر ژمـارەی سـەری میراتگرەکـانو بەشـە میراتەکـەیان (مُتَوافِـق) تێککەرەوە بوون (فَوِفْقُهُ ضُرِبَ فِيهَا) ئەو کاتە (وِفْق)ی ژمـارەی میراتگرەکـان دەبێتـە (جُزْءُ السَّهْم)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێ (وَلَوْ بِعَوْلِهَا) هەرچەند بە (عَوْل)ەوەش بێ، ئەگەر (عَوْل) کراو بـێ، یـان بـێ (عَـوْل) ئەگـەر (عَـوْل) نـەکراو بـێ (ثُـمَّ حُسِـبَ) ئینجا

فَمَا انْتَهَى الضَّــــرْبُ لَــهُ اَيْ وَصَلَــهْ ٣٤٥ فَإنَّــهُ تَصِــــــحُّ مِنْــــهُ الْمَسْـــــأَلَةْ
مِثَــالُ مَــالاَ يُوجَــدُ العَــوْلُ مَعَـــهْ ٣٤٦ أُمٌّ وَأَعْمَـــامٌ لأَصْـــلٍ أَرْبَعَــــــةْ
مِثَــالُ مَــا يَكُــونُ فِيــهِ العَـــــوْلُ ٣٤٧ سِـــتُّ بَنَـــاتٍ أَبَــوَانِ بَعْـــلُ

---

حیساب دەکرێ: (فَمَا انْتَهَى الضَّرْبُ لَهُ اَيْ وَصَلَـهْ) کۆی لێدانەکە گەیشتە کام ژمارە (فَإنَّهُ تَصِحُّ مِنْهُ الْمَسْأَلَةْ) ئەوە لەو ژمارەیە مەسەلەکە ساغ دەبێتەوە.

١- (مِثَالُ مَالاَ يُوجَـدُ العَـوْلُ مَعَـهْ) وێنـەی ئـەو (تَوافُق)ەی (عَـوْل)ی لەگـەڵ نـەبێ (أُمٌّ وَأَعْمَامٌ لأَصْلٍ أَرْبَعَةْ) دایکو چوار مامی لە باوکی: بنچینەی مەسـەلەکە لـە سـێیە -کـە بەشی دایکەکەی لێ دەردەچێ-: سێیەکی -یەکـە- بۆ دایکەکـەو، پاشماوەکـەیش -دووە- بۆ چوار مامەکانو بەسەریاندا بەش نابێو، ژمارەی مامەکان لەگەڵ بەشەکەیان (مُتَوَافِق) تێککـەرەوەن بـە نیوەیـی -چونکـە گشـت (مُتَداخِـل)ێـك بـە (مُتَوافِـق)ش دادەندرێ، هەروەك ڕابرا- کەوابوو: نیوەی چوار مامەکان -کـە دووە- دەبێتـە (جُـزْءُ السَّهْم)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێو لـە شـەش سـاغ دەبێتـەوە: دوو بـۆ دایکەکـەو، چوار بۆ مامەکان، بەم شێوەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣، میراتگر ______ | دایك، | چوار مام | |
| ١× بەشە میرات ______ | سێیەك، | پشتێیە | |
| ٣÷ ______ | ١ | + | ٢ بەسەر چواردا بەش نابێ |
| ٢× ______ ساغکردنەوە بە نیوەی چوار مامەکە | | | |
| ٦÷ ______ | ٢ | + | ٤ = ٦ |

٢- (مِثَالُ مَا يَكُونُ فِيهِ العَوْلُ) وێنەی ئەو (تَوافُق)ەی (عَوْل)ی تێدایە (سِتُّ بَنَاتٍ أَبَوَانِ بَعْلُ) شەش کیژو دایكو باوكو مێرد: بنچینەی مەسەلەکە لـە دوانزەیـە بـە لێدانـی سـێ لەچوار -کە بەشی مێردو کیژەکانیان لێ دەردەچێ- ئینجا (عَـوْل) دەکرێ بۆ پـانزە، چونکە دوو سێیەکی -هەشـتە- بۆ شـەش کیژەکـانو، شەشـێك -دووە- بـۆ دایـكو، شەشێکێکی تر -دووە- بـۆ بـاوكو، چوارێکـی -سـێیە- بـۆ مێردەکـە، بـەڵام بەشـی کیژەکان بەسەریاندا بەش نابێو، ژمارەی کیژەکان لەگەڵ بەشـەکەیان (مُتَوَافِـق)ن بـە نیوەیی، کەوابوو: نیوەی شـەش کیژەکـان -کـە سـێیە- دەبێتـە (جُـزْءُ السَّـهْم)و لـە مەسەلە (عَوْل) کراوەکەی دەدەینو، لە چلو پێنج سـاغ دەبێتـەوە: بیسـتو چـوار بـۆ کیژەکانو، شەش بۆ دایكو، شەش بۆ باوكو، نۆ بۆ مێردەکە، بەم شێوەیە:

وَإِنْ عَلَـى صِنْفَيْـنِ مِنْـهُمْ تَنْكَسِـرْ ٣٤٨ فَعَمَـلُ التَّصْحِيـحِ لَيْـسَ بِعَسِـرْ
إِذْ قُوبِلَـتْ سِـهَامُ كُـلٍّ بَعَـدَدْ ٣٤٩ رُؤُسِـهِ فَـإِنْ تَوَافَقَـا يُـرَدّْ
عَـدَدُهُ لِوِفْقِـهِ وَإِلاَّ ٣٥٠ فَإِنَّـهُ بِحَالِـهِ يُخَلَّـى
فَـالْعَدَدَانِ مِـنْ كِـلاَ الصِّنْفَيْـنِ ٣٥١ مَتَـى يَكُونَـا مُتَمَـاثِلَيْنِ

---

٤، میراتگر ــــــــ شەش کیژ، دایك، باوك، مێرد
٣× بەشە میرات ــــ دوو سێیەك، شەشێك، شەشێك، چوارێك
١٢÷ ــــــــ ٨ + ٢ + ٢ + ٠ چوارێك نا تەواوە
٣+ ــــ (عَوْل) بە چوارێك
١٥÷ ــــــــ ٨ + ٢ + ٢ + ٣ = ١٥
٣× ــــ ساغکردنەوە بە نیوەی شەش کیژەکان
٤٥÷ ــــــــ ٢٤ + ٦ + ٦ + ٩ = ٤٥

(وَإِنْ عَلَى صِنْفَيْنِ مِنْهُمْ تَنْكَسِرْ) ئەگەر بەشە میراتەکان بەسەر ژمارەی دوو جۆرە میراتگرەکاندا دەشکاوە، واتە: میراتگرەکان دوو جۆر بوونو بەشە میراتەکەی هیچێکیان بەسەریاندا بەش نەدەبوو، ئەوە (فَعَمَلُ التَّصْحِيحِ لَيْسَ بِعَسِرْ) کاری ساغکردنەوەی زەحمەت نیە (إِذْ قُوبِلَتْ سِهَامُ كُلِّ بَعَدَدِ رُؤُسِهِ) چونکە بەشە میراتەکانی هەر جۆرێکیان بەرامبەر بە ژمارەی سەرەکانیان دەکرێ: جیاوازی میراتگری پشتیو خاوەن بەش نیە، ئینجا تەماشا دەکەین: (فَإِنْ تَوَافَقَا) ئەگەر بەشە میراتەکانو ژمارەی سەری میراتگرەکانی هەردوو جۆرەکە، یان جۆرێکیان (مُتَوَافِق) تێککەرەوە بوون، ئەوە (يُرَدّ عَدَدُهُ لِوِفْقِه) ژمارەی میراتگرەکانی جۆرە تێککەرەوەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ (وِفْق)ی خۆی (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر (مُتَوَافِق) نەبوون، بەڵکو ژمارەی هەردووکیان، یان یەکێکیان لەگەڵ بەشەکانیان (مُتَبَاين) ڕێکنەکەوتوو بوون، ئەو کاتە (فَإِنَّهُ بِحَالِهِ يُخَلَّى) جۆرەکەی (مُتَبَاين) وەکو خۆی دەهێشترێتەوەو، دەستکاری ناکرێ، **جـا بزانـە:** لێرەشدا ئەگەر (مُتَماثِل)، یان (مُتَداخِل) بن، واتە: ژمارەی میراتگرەکان بچێتە ناو بەشەکانیان، ئەو کاتەش بەشەکان ناشکێنەوەو بەساغی بەش دەبن. ئینجا لە دوای گەڕاندنەوەکە بۆ (وِفْق)و لە دوای هێشتنەوەکە، دیسان کەتەماشای ژمارەی سەری میراتگرەکان دەکەینەوە: چوار حاڵەتیان هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:** (فَالْعَدَدَانِ مِنْ كِلاَ الصِّنْفَيْنِ) ژمارەی سەری میراتگرەکان لە هەردوو جۆرەکان (مَتَى يَكُونَا مُتَمَاثِلَيْنِ) هەر کاتێك (مُتَماثِل) هاوێنە بوون، ئەوە (ضَرَبْتَ

ضَرَبْــتَ مِنْــهُمَا تَمَـــــامَ العَـــــدَدِ٣٥٢ فِــي أَصْلِــهَا بِعَوْلِــهَا إِنْ يُوجَـــــدِ
وَإِنْ تَدَاخَـــلاَ ضَرَبْـــــتَ الأَكْـــــثَرَا٣٥٣ فِي ذَلِكَ الأَصْـــلِ بَعَــوْلٍ إِنْ جَــرَى

---

مِنْهُمَا تَمَـامَ العَـدَدَ فِـي أَصْلِـهَا) لـه هـەردوو جۆرەكـان تەنـها يـەكێكيان دەبێتـە (جُـزْءُ السَّهْم)و بە تەواوی لە بنچینەی مەسەلەكە دەدریٚ بەبیٚ (عَوْل)، یان (بِعَوْلِـهَا إِنْ يُوجَـدِ) بە (عَوْل)ەوە ئەگەر (عَوْل) هەبیٚ، ئینجا كۆی لێدانەكە گەیشتە كام ژمـارە، ئـەوە لـەو ژمارەیە مەسەلەكە ساغ دەبێتەوە.

**بۆ وێنە:** دایكو شەش برای لە دایكیو دوانزە خوشكی لە باوكی: بنچینــەی مەســەلەكە لە شەشە –كە بەشی دایكەكەی لیٚ دەردەچیٚ– جا (عَـوْل) دەكـریٚ بـۆ حـەفت چونكـە شەشێكی –یەكە– بۆ دایكەكەو، سێیەكی –دووە– بـۆ شـەش برایـەكانی لـە دایكـیو، دوو سـێیەكی –چـوارە– بـۆ دوانــزە خوشــكەكان، ئینجـا بەشــی شــەش برایــەكان بەسەریاندا بەش نابیٚو، بەشــەكەیانو ژمارەكـەیان (مُتَوَافِـق)ن بـە نیوەیـی، كـەوابوو: ژمارەی برایەكان دەگەڕێندرێتەوە بـۆ نیـوەی شـەش –كـە سـێیە–، هـەروەها بەشـی دوانزە خوشكەكانیش بەسەریاندا بەش نابیٚو، بەشەكەیانو ژمارەكەیان (مُتَوَافِق)ن بە چوارێك، كەوابوو: ژمارەی خوشكەكانیش دەگەڕێندرێتــەوە بـۆ چوارێكـی دوانـزە –كـە سێیە– ئینجا ئەم سێیەی سەری خوشكەكانو سـێیەكەی سـەری برایـەكان (مُتَمـاثِل) هاووێنـەن، كـەوابوو: تـەنـها یـەكێكیان دەبێتـە (جُـزْءُ السَّهْم)و لـە مەســەلەی (عَــوْل) كراوەكە دەدریٚو لە بیستو یەك ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

| | | دایك، | شەش برای لە دایكی، | دوانزە خوشكی لە باوكی |
|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر | | | | |
| ١× | بەشە میرات | شەشێك، | سێیەك، | دوو سێیەك |
| ÷٦ | | ٠ + | ٢ + | ٤، شەشێك نا تەواوە |
| +١ | (عَوْل) بە شەشێك | | | |
| ÷٧ | | ١ + | ٢ + | ٤ = ٧ |
| ×٣ | ساغكردنەوە بە ژمارە سیٚ كە (وِفْق)ی خوشك، یان برایەكانە) | | | |
| ÷٢١ | | ٣ + | ٦ + | ١٢ = ٢١ |

**حاڵەتی دووەم:** (وَإِنْ تَدَاخَلاَ) ئەگەر ژمارەی سـەری میراتگرەكـانی هـەردوو جۆرەكـان (مُتَداخِل) تێكڕاچوو بوون، ئـەو كاتـە (ضَرَبْـتَ الأَكْـثَرَا فِـي ذَلِـكَ الأَصْـل) زۆرترەكـەیان دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لە بنچینەی مەسەلەكە دەدریٚ، بیٚ (عَوْل)، یان (بَعَوْلٍ إِنْ جَـرَى) بە (عَوْل)ەوە، ئەگەر (عَوْل) كراو بیٚ، ئینجا كۆی لێدانەكە گەیشـتە كـام ژمـارە، ئـەوە لەو ژمارەیە مەسەلەكە ساغ دەبێتەوە.

وَإِنْ تَوَافَقَا بِجُزْءٍ فَاعْمَدِ ٣٥٤ لِضَرْبِ وِفْقِ عَدَدٍ فِي عَدَدِ
مَعْ ضَرْبِكَ الْحَاصِلَ فِي ذَا الأَصْلِ ٣٥٥ مَعْ عَوْلِهَا عِنْدَ وُجُودِ الْعَوْلِ

---

**بۆ وێنە:** دایكو چوار برای لە دایكیو چوار مام: بنچینەی مەسەلەكە لە شەشە -كە بەشی دایكەكەی لێ دەردەچێ-: شەشێكی -یەكە- بۆ دایكەكەو، سێیەكی -دووە- بۆ چوار برایەكانی لە دایكیو، پاشماوەكەشی -سێیە- بۆ چوار مامەكان، ئینجا بەشی چوار برایەكان بەسەریاندا بەش نابێو، بەشەكەیانو ژمارەكەیان (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، كەوابوو: ژمارەی برایەكان دەگەڕێندرێتەوە بۆ نیوەی چوار -كە دووە-، هەروەها بەشی چوار مامەكانیش بەسەریاندا بەش نابێو، بەشەكەیانو ژمارەكەیان (مُتَبَاين)ن، كەوابوو: ژمارەی چوار مامەكان وەكو خۆیان دەهێشترێتەوە، ئینجا ژمارە دووی سەری برایەكان لەگەڵ ژمارە چواری سەری مامەكان (مُتَداخِل)ن، كەوابوو: زۆرترەكەیان -كە چوارە- دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم) لە تەواوی مەسەلەكە دەدرێو لە بیستو چوار ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر ــــــــ | دایك، | چوار برای لە دایكی، | چوار مام | |
| ١× بەشە میرات ــــــ | شەشێك، | سێیەك، | پشتێنە | |
| ÷٦ ــــــــــــــ | ١ + | ٢ + | ٣ | = ٦ |
| ×٤ ــــ ساغ كردنەوە بە ژمارەی چوار مام | | | | |
| ÷٢٤ ــــــــــــ | ٤ + | ٨ + | ١٢ | = ٢٤ |

**حاڵەتی سێیەم:** (وَإِنْ تَوَافَقَا بِجُزْءٍ) ئەگەر ژمارەی سەری میراتگرەكانی هەردوو جۆرەكان بە بەشێكیان (مُتَوَافِق) تێككەرەوە بوون، ئەو كاتە (فَاعْمَدِ لِضَرْبِ وِفْقِ عَدَدٍ فِي عَدَدِ) یەكەمجار هەوڵ بدە بۆ لێدانی (وِفْق) ژمارەی میراتگرەكانی جۆرێك لە تەواوی ژمارەی جۆرەكەی تر (مَعْ ضَرْبِكَ الْحَاصِلَ فِي ذَا الأَصْلِ) جا كۆی ئەو ژمارەیەی لەو لێدانە پەیدا بووە، ئەو دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لە تەواوی بنچینەی مەسەلەكەی بدە: بەبێ (عَوْل)، یان (مَعْ عَوْلِهَا عِنْدَ وُجُودِ الْعَوْلِ) لەگەڵ (عَوْل)ەكەی ئەگەر (عَوْل) هەبێ، ئینجا بەو لێدانەش گەیشتە كام ژمارە، ئەوە لەو ژمارەیە مەسەلەكە ساغ دەبێتەوە.

**بۆ وێنە:** دایكو دوانزە برای لە دایكیو شانزە خوشكی لە باوكی: بنچینەی مەسەلەكە لە شەشە -كە بەشی دایكی لێ دەردەچێ- (عَوْل) دەكرێ بۆ حەفت، چونكە شەشێكی -یەكە- بۆ دایكەكەو، سێیەكی -دووە- بۆ دوانزە برایەكانی لە دایكیو، دوو سێیەكی -چوارە- بۆ شانزە خوشكەكانی لە باوكی، ئینجا بەشی دوانزە برایەكان

وَإِنْ يَكُونَا مُتَبَايِنَيْنِ٣٥٦ فَاضْرِبْ تَمَامَ عَدَدِ مِنْ ذَيْنِ
فِي الْعَدَدِ الآخَرِ وَاضْرِب مَا حَصَلْ٣٥٧ فِي الأَصْلِ بِالعَوْلِ فَأَيْنَمَا وَصَلْ
فَمِنْهُ قَدْ صَحَّتْ وَلاَ كَسْرَ مَعَهْ٣٥٨ كَذَا عَلَى ثَلاَثَةٍ وَأَرْبَعَةْ

---

بەسەریاندا بەش نابێ‌و بەشەکەیان‌و ژمارەکەیان (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی –چونکە گشت (مُتَداخِل)ێك بە (مُتَوَافِق) دادەندرێ– کەوابوو: ژمارەی برایەکان دەگەڕێندرێتەوە بۆ نیوەی دوانزە –کە شەشە–، هەروەها بەشی شانزە خوشکەکانیش بەسەریاندا بەش نابێ‌و، بەشەکەیان‌و ژمارەکەیان (مُتَوَافِق)ن بە چوارێك، کەوابوو: ژمارەی خوشکەکانیش دەگەڕێندرێتەوە بۆ چوارێکی شانزە –کە چوارە– ئینجا ئەم چوارەی سەری خوشکەکان‌و شەشەکەی سەری برایەکانیش (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، کەوابوو: نیوەی یەکێکیان لە تەواوی ئەوی تر دەدرێ‌و دەگاتە دوانزە، ئینجا ئەم دوانزەیە دەبێتە (جـزءُ السّهم)و لە مەسەلە (عَوْل) کراوەکە دەدرێ‌و لە هەشتاو چوار ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

٦، میراتگر ـــــــ دایك، دوانزە برای لە دایکی، شانزە خوشکی لە باوکی
١× بەشە میرات ــــ شەشێك، سێیەك، دوو سێیەك
٦÷ ـــــــ ٠ + ٢ + ٤، شەشێك نا تەواوە
١× ـــ (عَوْل) بە شەشێك
٧÷ ـــــ ١ + ٢ + ٤ = ٧
١٢× ـــ ساغ کردنەوە بە لێدانی ٣×٤=١٢
٨٤÷ ـــــ ١٢ + ٢٤ + ٤٨ = ٨٤

**حاڵەتی چوارەم:** (وَإِنْ يَكُونَا مُتَبَايِنَيْنِ) ئەگەر ژمارەی سەری میراتگرەکانی هەردوو جۆرەکان (مُتَبايِن) ڕێکنەکەوتوو بوون، ئەو کاتەش (فَاضْرِبْ تَمَامَ عَدَدٍ مِنْ ذَيْنِ فِي الْعَدَدِ الآخَرِ) یەکەمجار تەواوی ژمارەی میراتگرەکانی جۆرێك لە تەواوی ژمارەی جۆرەکەی تر بدە، ئینجا (وَاضْرِب مَا حَصَلَ فِي الأَصْلِ) کۆی ئەوە ژمارەیەی لەو لێدانە پەیدا بووە، ئەو دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە تەواوی بنچینەی مەسەلەکەی بدە (بِالعَوْلِ) بە (عَوْل)ەوە، یان بێ (عَوْل)، ئینجا (فَأَيْنَمَا وَصَلْ) بەو لێدانەش گەیشتە کام ژمارە (فَمِنْهُ قَدْ صَحَّتْ) هەر لەو ژمارەیەش مەسەلەکە ساغ دەبێتەوەو (وَلاَ كَسْرَ مَعَهْ) شکانەوەی لەگەڵدا نابێ.

**بۆ وێنە:** دایك‌و سێ کیژو دوو برای لە باوکی، بنچینەی مەسەلەکە لە شەشە –کە بەشی دایکەکەی لێ دەردەچێ– شەشێکی –یەکە– بۆ دایکەکەو، دوو سێیەکی –

چواره– بۆ سێ کیژەکان‌و، پاشماوەکەیشی –یەکە– بـۆ دوو برایـەکان، ئینجا بەشـی سێ کیژەکان بەسەریاندا بەش نابێ‌و، بەشەکەیان‌و ژمارەکـەیان (مُتَبـايِن)ن، کـەوابوو: ژمارەی سێ کیژەکان وەکـو خـۆی دەهێشـترێتەوە، هـەروەها بەشـی دوو برایـەکانیش بەسەریاندا بەش نابێ‌و، بەشەکەیان‌و ژمارەکـەیان (مُتَبـايِن)ن، کـەوابوو: ژمـارەی دوو برایەکانیش وەکو خۆی دەهێشترێتەوە، ئینجا ئەم دووەی سەری برایەکان‌و سـێیەکەی سەری کیژەکانیش (مُتَبايِن)ن، کەوابوو: تەواوی یەکێکیان لە تەواوی ئەوی تر دەدرێ‌و دەگاتە شەش، ئینجا ئەم شەشە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدەین‌و لە سی‌و شەش ساغ دەبێتەوە، بەم شێوەیە:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦، میراتگر | دایک، | سێ کیژ، | دوو برا | |
| ١× بەشە میرات | شەشێک، | دوو سێیەک، | پشتێنە | |
| ÷٦ | ١ + | ٤ + | ١ | = ٦ |
| ×٦ | ساغ کردنەوەی بە لێدانی ٢×٣=٦ | | | |
| ÷٣٦ | ٦ + | ٢٤ + | ٦ | = ٣٦ |

(كَذَا) وەك شکانەوەی سەر دوو جۆرە مـیراتگر وایـە (عَلَـى ثَلاَثَـةٍ وَأَرْبَعَـةٍ) شـکانەوەی بەشە میراتەکان بەسەر سێ جۆرە میراتگرو چوار جۆرە میراتگردا، واتە: ئەگـەر بەشـە میراتەکانی سێ جۆرە میراتگر، یان چـوار جـۆرە مـیراتگر بەسـەریاندا بـەش نـەدەبوو، ئەوە لێرەشـدا بـە هـەمان شێوەی چوار حاڵەتەکەی ڕابـردوو ڕەفتـار دەکرێ، واتـە: ژمارەی هەرسێك جۆرەکـان، یـان هـەر چوار جۆرەکـان بەرامبـەر بەشـە میراتـەکانیان دەکرێ: ئەگەر (مُتَوَافِق) بوون، ئەوە سەرەکان دەگەڕێندرێنەوە بۆ (وِفْـق)ی خۆیـان‌و، ئەگەر (مُتَبايِن) بـوون، ئـەوە وەکـو خۆیـان دەهێشـترێنەوە، ئینجـا تەماشـا دەکـەین: ژمارەی هەرسێك جۆرەکان، یان هەر چوار جۆرەکانیش: ئەگەر (مُتَماثِل) بـوون، ئـەوە تەنها یەکێکیان دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لە مەسـەلەکە دەدرێ، ئەگـەر (مُتَداخِـل) بـوون، ئـەوە زۆرترەکـەیان دەبێتـە (جُزْءُ السَّهْم)و لـە تـەواوی مەسـەلەکە دەدرێ، ئەگـەر (مُتَوَافِق) بوون، ئەو کاتە (وِفْق) یەکێکیان لە یەکێکی تر دەدرێ‌و کۆی ئەو لێدانەش لە (وِفْق)ی ژمارەکەی تـر دەدرێ، ئینجا کـۆی ئـەو لێدانـەش دەبێتـە (جُزْءُ السَّهْم)و لـە تەواوی مەسەلەکە دەدرێ. ئەگەر (مُتَبايِن) بوون، ئـەوە یـەکێکیان لـەوی تـر دەدرێ‌و، کۆی ئەو لێدانەش لەوی تر دەدرێ، ئینجا کۆی ئەو لێدانەش دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لـە تەواوی مەسەلەکە دەدرێ (وَلاَ يَزِيدُ فِي سِوَى الـوَلاَءِ) لـە شـکانەوەی بەشـە میراتـەکان

بەسەر چوار جۆردا زیاتر نابێ جگە لە خزمایەتی کۆیلە ئازاد کردندا نەبێ (وَذَاكَ مَعْلُومٌ بِالإِسْتِقْرَاءِ) ئەوەش بە پێداچوونەوەی مەسەلەکاندا زاندراوە.

**وێنەیەکی سێ جۆری:** دوو داپیرەو سێ برای لە دایکیو دوو مام: بنچینەی مەسەلەکە لە شەشە -کە بەشی داپیرەکانی لێ دەردەچێ-: شەشێکی -یەکە- بۆ دوو داپیرەکەو، سێیەکی -دووە- بۆ سێ برا لە دایکیەکەو، پاشماوەکەیشی -سێیە- بۆ دوو مامەکە، ژمارەی هەسێك جۆرە میراتگرەکان لەگەڵ بەشەکانیان (مُتَبَايِن)ن، کەوابوو: ژمارەی سەری گشتیان وەکو خۆی دەهێشترێتەوە، ئینجا ژمارەی سەری دوو داپیرەکەو دوو مامەکە (مُتَمَاثِل)نو لەگەڵ ژمارەی سەری سێ برایەکان (مُتَبَايِن)ن، کەوابوو: ژمارەی یەکێکیان لە تەواوی ژمارەی سێ برایەکان دەدرێو دەگاتە شەش، ئینجا ئەم شەشە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێو لە سێو شەش ساغ دەبێتەوە: شەش بۆ دوو داپیرەکەو، دوانزە بۆ سێ برایەکەو، هەژدە بۆ دوو مامەکان.

**وێنەیەکی چوار جۆری:** دوو ژنو چوار داپیرەو سێ برای لە دایکیو دوو مام، بنچینەی مەسەلەکە لە دوانزەیە بە لێدانی سێ لە چوار -کە بەشی ژنەکانو برایەکانیان لێ دەردەچێ-: چوارێکی -سێیە- بۆ دوو ژنەکانو، شەشێکی -دووە- بۆ چوار داپیرەکانو، سێیەکی -چوارە- بۆ سێ برایەکانو، پاشماوەکەیشی -سێیە- بۆ دوو مامەکان، ژمارەی چوار داپیرەکانو بەشەکەیان (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، کەوابوو: ژمارەی داپیرەکان دەگەڕێندرێتەوە بۆ نیوەی چوار -کە دووە- ژمارەی سێ جۆرەکانی تریش لەگەڵ بەشەکەیان (مُتَبَايِن)ن، کەوابوو: ژمارەی سەری هەرسێکیان وەکو خۆیان دەهێشترێتەوە، ئینجا ژمارەی سەری داپیرەکانو ژنەکانو مامەکان (مُتَمَاثِل)نو لەگەڵ ژمارەی سێ برایەکانیش (مُتَبَايِن)ن، کەوابوو: یەکێکیان لە تەواوی ژمارەی سێ برایەکان دەدرێو دەگاتە شەش، ئەم شەشە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْمِ)و لە تەواوی مەسەلەکە دەدرێو لە حەفتاو دوو ساغ دەبێتەوە: هەژدە بۆ دوو ژنەکانو، دوانزە بۆ چوار داپیرەکانو، بیستو چوار بۆ سێ برایەکانو، هەژدە بۆ دوو مامەکان.

**ئینجا بزانە:** لە ساغ کردنەوەی مەسەلەکاندا گوتمان: ئەو ژمارەیەی بۆ ساغ کردنەوە لە مەسەلەکە دەدرێ پێی دەگوترێ: (جُزْءُ السَّهْمِ)ی مەسەلەکە، واتە: پارچەیەکی بەشە میراتێکی مەسەلەکە پێش ساغ کردنەوە، جا لەبەر ئەوەی لێرەدا مەبەست

وَكُلُّ صِنْفٍ تُعْرَفُ النَّصِيبُ لَهُ ٣٦٠ مِنْ عَدَدٍ قَدْ بَلَغَتْهُ الْمَسْئَلَةْ
بِضَرْبِ حِصَّةٍ لَهُ يَحْوِيهَا ٣٦١ مِنْ أَصْلِهَا فِيمَا ضَرَبْتَ فِيهَا
فَالْمُنْتَهَى نَصِيبُهُ الْمَعْلُومُ ٣٦٢ وَهُوَ عَلَى عَدَدِهِ الْمَقْسُومِ

---

بەشكردنی بەشە میراتەكانە -بە ساغی- پێویستە (جُزْءُ السَّهْم)ی گشت مەسەلەیەكی ساغ دەكرێتەوە بزانین، چونكە (وَكُلُّ صِنْفٍ تُعْرَفُ النَّصِيبُ لَهُ) گشت جۆرە میراتگرێك -لە دوای ساغكردنەوەی مەسەلەكە- بەشە میراتەكەی دەزاندرێ (مِنْ عَدَدٍ قَدْ بَلَغَتْهُ الْمَسْئَلَةُ) لەو ژمارەیەی مەسەلەكەی لێ ساغ بۆتەوە (بِضَرْبِ حِصَّةٍ لَهُ يَحْوِيهَا مِنْ أَصْلِهَا) بە لێدانی ئەو بەشە میراتەی كە لە بنچینەی مەسەلەكە -پێش ساغكردنەوە- گرتبووی: بێ (عَوْل)، یان بە (عَوْل) كراوی (فِيمَا) لەو (جُزْءُ السَّهْم)ەی كە (ضَرَبْتَ فِيهَا) لە بنچینەی مەسەلەكەت دابوو بۆ ساغكردنەوەكە (فَالْمُنْتَهَى) بەو لێدانە گەیشتە چەند، ئەوە كۆی لێدانەكە (نَصِيبُهُ الْمَعْلُومُ) بەشە میراتەكەیەتی لە ساغ كراوەكە (وَهُوَ عَلَى عَدَدِهِ الْمَقْسُومِ) هەر كۆی لێدانەكەش بەسەر ژمارەی میراتگرەكانی جۆرەكەدا بەش دەكرێ‌و بەساغی دەردەچێ.

**ڕوونكردنەوە:** لە وێنەی یەكەمی ئەم لقەدا: بنچینەی مەسەلەكە لە دووو بووو لە چوار ساغ دەبۆوەو، (جُزْءُ السَّهْم) ی مەسەلەكەش دووە، جا لە بنچینەی مەسەلەكە: مێردەكە یەكی گرتبووو لە دووەكەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێ‌و لە ساغكراوەكە بەشی دەبێتە دوو، برایەكانیش یەكیان گرتبووو لە دووەكەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێ‌و لە ساغكراوەكە بەشیان دەبێتە دوو. هەروەها لە وێنەی دووەمی ئەم لقەدا: بنچینەی مەسەلەكە بە (عَوْل) كراوی لە حەفت بووە، لە سی‌و پێنج ساغ بۆتەوەو، (جُزْءُ السَّهْم)ی مەسەلەكەش پێنجە، جا لە بنچینەی مەسەلە (عَوْل) كراوەكە: مێردەكە سێی گرتبووو لە پێنجەكەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێ‌و لە ساغكراوەكە بەشی دەبێتە پانزە، پێنج خوشكەكانیش چواریان گرتبووو لە پێنجەكەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێ‌و لە ساغكراوەكە بەشیان دەبێتە بیست.

هەروەها لە مەسەلەكەی حاڵەتی یەكەمیش -كە وێنەی دوو جۆرە میراتگر بوو- (جُزْءُ السَّهْم)ی مەسەلەكە سێ بوو، لە بنچینەی مەسەلە (عَوْل) كراوەكەش: دایكەكە یەكێكی گرتبووو لە سێیەكەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێ‌و لە ساغكراوەكە بەشی دەبێتە سێ، شەش برایەكانیش دوویان گرتبووو لە سێیەكەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێ‌و لە ساغكراوەكە

مَبْحَثُ مَسَائِلِ الرَّدِّ

فَرْعٌ: ذَكَرْتُ الرَّدَّ قَبْلُ مُجْمَلاً ٣٦٣ وَهَيهُنَا أَذْكُرُهُ مُفَصَّلاَ
مَسَائِلُ الرَّدِّ عَلَى أَقْسَامِ ٣٦٤ أَرْبَعَةٍ يَجْمَعُهَا نِظَامِي
إِذَا فَقَدْتَ مَنْ عَلَيْهِ لاَ يُرَدّ ٣٦٥ وَكَانَ أَهْلُ الرَّدِّ صِنْفاً اتَّحَدْ

---

بەشیان دەبێتە شەش، دوانزە خوشکەکانیش چواریان گرتبووو لە سێیەکەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێو لە ساغکراوەکە بەشیان دەبێتە دوانزە. هەروەها لە وێنەکەی سێ جۆریش: (جُزْءُ السَّهْم)ی مەسەلەکە شەش بوو، لە بنچینەی مەسەلەکەش: دوو داپیرەکان یەکێکیان گرتبوو لە شەشەکەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێو لە ساغکراوەکە بەشیان دەبێتە شەش، سێ برایەکانیش دوویان گرتبووو لە شەشەکەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێو بەشەکەیان لە ساغکراوەکە دەبێتە دوانزە، دوو مامەکانیش سێیان کرتبوو لە شەشەکەی (جُزْءُ السَّهْم) دەدرێو بەشەکەیان لەساغکراوەکە دەبێتە هەژدە. ئیتر هەر بەو جۆرە: بەشی گشت میراتگرێك -کە پێش ساغکردنەوە لە بنچینەی مەسەلەکە گرتوویەتی- لەو (جُزْءُ السَّهْم)ە بدە: کە لە بنچینەی مەسەلەکەت داوە، ئینجا کۆی ئەو لێدانە دەبێتە بەشی هەمان میراتگر لە ساغکراوەکە، وَالْحَمْدُ لله تَعَالَى.

## ﴿فَرْعٌ فِي مَبْحَثِ مَسَائِلِ الرَّدِّ: لقێك لە باسی ساغکردنەوەی مەسەلەکانی (الرَّدّ)﴾

واتە: گەڕاندنەوەی میراتە زێدەکە بۆ خاوەن بەشەکان (ذَكَرْتُ الرَّدَّ قَبْلُ مُجْمَلاً) لە باسی ژماردنی میراتگرەکاندا بەکورتی باسی گەڕاندنەوەی میراتە زیادەکەم کردو گوتم: ئەگەر میراتگری پشتێو (بَيْت الْمَال) نەبوو، ئەوە میراتە زیادەکە بۆ خاوەن بەشەکانی جگە لە ژنو مێرد دەگەڕێندرێتەوە (وَهَيهُنَا أَذْكُرُهُ مُفَصَّلاَ) ئەوە لێرەشدا بە درێژی باسی دروستکردنو ساغکردنەوەی ئەو مەسەلانە دەکەمو دەڵێم: (مَسَائِلُ الرَّدِّ عَلَى أَقْسَامِ أَرْبَعَةٍ) مەسەلەکانی (الرَّدّ) گەڕاندنەوەی میراتە زیادەکە بۆ خاوەن بەشەکان - هەروەك لە (الأنوار)شدا ڕوون کراوەتەوە- چوار بەشە (يَجْمَعُهَا نِظَامِي) ئەم هۆنراوەی من کۆیان دەکاتەوە.

**بەشی یەکەم:** خاوەن بەشەکان یەك جۆر بن‌و، ژنو مێردیان لەگەڵدا نەبێ، کەوابوو: (إِذَا فَقَدْتَ مَنْ عَلَيْهِ لاَ يُرَدّ) هەر کاتێك میراتگرێکی وەهات دەست نەکەوت کە میراتە زێدەکەی بۆ ناگەڕێندرێتەوە، واتە: لەگەڵ میراتگرەکاندا ژنو مێرد نەبوون (وَكَانَ أَهْلُ

فَعَـدَدُ الـرُّؤُسِ أَصْـلُ الْمَسْــئَلَةْ ٣٦٦ كَمَـنْ يَمُـوتُ عَـنْ شَـقِيقَتَيْنِ لَـهْ
أَوْ وَلَــدَيْ أُمٍّ أَوِ ابْنَتَيْــنِ ٣٦٧ أَوْ جَدَّتَيْــنِ رُجِعَــتْ لإِثْنَيْــنِ
أَوْ جَـاوَزُوا صِنْفـاً فَأَصْلُـهَا عَـدَدْ ٣٦٨ سِهَامِهِمْ لَـوْ لَـمْ يَكُـنْ هُنَـاكَ رَدّْ
كَـأَنْ حَـوَتْ مَسْـئَلَةَ سُدْسَـيْنِ ٣٦٩ فَرُجِعَـتْ مِـنْ سِـتَّةٍ لإِثْنَيْـنِ
أَوْ كَـانَ فِيـهَا ثُلُـثٌ يَجْتَمِـعُ ٣٧٠ مَـعْ سُـدُسٍ إِلَـى ثَـلاَثٍ تُرْجَـعُ

---

الرَّدِّ صِنْفاً اتَّحَدْ) خاوەن بەشەكانیش -كە میراتەكەیان بۆ دەگەڕاندراوە- تەنها یەك جۆرە میراتگر بوون، واتە: یەك جۆرە بەشە میراتیان دەگرت، ئەوە (فَعَدَدُ الرُّؤُسِ أَصْلُ الْمَسْئَلَةْ) ژمارەی سەری خاوەن بەشەكان دەبێتە بنچینەی مەسەلەكە: (كَمَنْ يَمُوتُ عَنْ شَقِيقَتَيْنِ لَهْ) وەك یەكێك بمرێو دوو خوشكی لەپاش بەجێ بمێنن (أَوْ وَلَدَيْ أُمّ) یان دوو برای لە دایكی (أَوِ ابْنَتَيْنِ) یان دوو كیژ، لە هەرسێكیاندا بنچینەی مەسەلەكان لە سێیە (أَوْ جَدَّتَيْنِ) یان دوو داپیرە: كە مەسەلەكەیان لە شەشە، بەڵام بۆ كورتكردنەوە (رُجِعَتْ لإِثْنَيْنِ) لە هەر چواریان مەسەلەكە دێتەوە سەر دوو، هەر یەكەو نیوەیان، هەروەها ئەگەر سێ بن دێتەوە سەر سێ: هەر یەكەو سێیەكیان، ئەگەر چوار بن دێتەوە سەر چوار: هەر یەكەو چوارێكیان... بەو جۆرە.

**بەشی دووەم:** خاوەن بەشەكان لە یەك جۆر زیاتر بن‌و، ژن‌و مێردیان لەگەڵدا نەبێ، كەوابوو: (أَوْ جَاوَزُوا صِنْفاً) هەر كاتێك لەگەڵ میراتگرەكاندا ژن‌و مێرد نەبووو خاوەن بەشەكانیش -كە میراتە زێدەكەیان بۆ دەگەڕاندەوە- لە یەك جۆر زیاتر بوون، واتە: دوو جۆرە بەشە میرات، یان زیاتریان دەگرت، ئەوە (فَأَصْلُهَا عَدَدُ سِهَامِهِمْ) بنچینەی مەسەلەكەیان دێتەوە سەر ژمارەی ئەو بەشە میراتانەی لە لێدەرچووی بەشەكان وەردەگیرێن (لَوْ لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ رَدّ) ئەگەر لە مەسەلەكەدا گەڕاندنەوەی میراتەكە نەبووایە: (كَأَنْ حَوَتْ مَسْئَلَةَ سُدْسَيْنِ) وەك مەسەلەكە دوو شەشێك كۆ بكاتەوە: وەكو داپیرەیەك‌و خوشكێكی لە دایكی (فَرُجِعَتْ مِنْ سِتَّةٍ لإِثْنَيْنِ) مەسەلەكەیان لە شەشەوە دێتەوە سەر دوو، چونكە دوو شەشێك دەكاتە دوو، كەوابوو: لەو دووە هەر یەكەو یەكێكیان (أَوْ كَانَ فِيهَا ثُلُثٌ يَجْتَمِعُ مَعْ سُدُسٍ) یان لە مەسەلەكەدا سێیەكێك‌و شەشێكێك هەبوون، وەكو دایك‌و دوو خوشكی لە دایكی، ئەوە مەسەلەكە لەشەشە، بەڵام (إِلَى ثَلاَثٍ تُرْجَعُ) دێتەوە سەر سێ، چونكە سێیەك‌و شەشێك دەكاتە سێ، كەوابوو: لەو سێیە: دوو بۆ خوشكەكان‌و، یەكێك بۆ دایكەكە.

أَوْ كَانَ فِيهَا النِّصْفُ وَالسُّدْسُ مَعَهْ ٣٧١ قَدْ رُجِعَتْ مِنْ سِتَّةٍ لأَرْبَعَهْ
أَوْ كَانَ سُدْسٌ مَعَهُ ثُلْثَانِ ٣٧٢ أَوْ كَانَ نِصْفٌ مَعَهُ سُدْسَانِ
أَوْ ثُلُثٌ يَنْضَمُّ فَرْضُ النِّصْفِ لَهْ ٣٧٣ فَالْخَمْسُ فِي الثَّلاَثِ أَصْلُ الْمَسْئَلَةْ
وَإِنْ وَجَدْتَ مَنْ عَلَيْهِ لاَ يُرَدّْ ٣٧٤ مَعْ أَهْلِ رَدٍّ صِنْفُهُمْ قَدِ اتَّحَدْ
فَفَرْضُ مَنْ لاَ يَسْتَحِقُّ رَدًّا ٣٧٥ إِلَيْهِ مِنْ مَخْرَجِهِ يُؤَدَّى
ثُمَّ لأَهْلِ الرَّدِّ بَاقِيهِ مُنِحْ ٣٧٦ فَقَسْمُهُ عَلَى الرُّؤُسِ إِنْ يَصِحّْ

---

(أَوْ كَانَ فِيهَا النِّصْفُ وَالسُّدْسُ مَعَهْ) یان له مەسەلەكەدا نیوەیەكو شەشیێكیك هەبوون: وەكو كیژێكو دایك، ئەوەش (قَدْ رُجِعَتْ مِنْ سِتَّةٍ لأَرْبَعَةٍ) لە شەشەوە دێتەوە سەر چوار، چونكە نیوەو شەشیێك دەكاتە چوار، كەوابوو: لەو چوارە: سێ بۆ كیژەكەو، یەكێك بۆ دایكەكە (أَوْ كَانَ سُدْسٌ مَعَهُ ثُلْثَانِ) یان لە مەسەلەكەدا شەشیێكیكو دوو سێیەك هەبوون: وەكو دوو كیژو دایك (أَوْ كَانَ نِصْفٌ مَعَهُ سُدْسَانِ) یان نیوەیەكو دوو شەشیێك هەبوون: وەك كیژێكو كیژە كوڕێكو دایك (أَوْ ثُلُثٌ يَنْضَمُّ فَرْضُ النِّصْفِ لَه) یان سێیەكێكو نیوەیەك هەبوون: وەكو دایكو خوشكێكی لە باوكی، ئەوە هەرسێك مەسەلەكان لە شەشن، بەلاّم بۆ كورتی (فَالْخَمْسُ فِي الثَّلاَثِ أَصْلُ الْمَسْئَلَةِ) لە هەرسێكیاندا پێنج دەبێتە بنچینەی مەسەلەكە، چونكە شەشیێكیكو دوو سێیەك دەكاتە پێنج، نیوەو دوو شەشیێك دەكاتە پێنج، سێیەكو نیوە دەكاتە پێنج، كەوابوو: لە بنچینەكەی یەكەم یەكێك بۆ دایكو چواریشی بۆ دوو كیژەكان...بەو جۆرە.

**بەشی سێیەم:** خاوەن بەشەكان یەك جۆر بن، بەلاّم ژن، یان مێرد لەگەڵدا بێ (وَإِنْ وَجَدْتَ مَنْ عَلَيْهِ لاَ يُرَدّْ) ئەگەر میراتگری وەهات دەست كەوت: كە میراتەكەی بۆ ناگەڕێندرێتەوە، واتە: ژن، یان مێرد هەبوو (مَعْ أَهْلِ رَدّْ) لەگەڵ ئەو میراتگرانەدا: كە میراتە زێدەكەیان بۆ دەگەڕێندرێتەوەو (صِنْفُهُمْ قَد اتَّحَدْ) جۆرەكەشیان یەك جۆر بوو، واتە: یەك بەشە میراتیان دەگرت، ئەو كاتە (فَفَرْضُ مَنْ لاَ يَسْتَحِقُّ رَدًّا) بەشە میراتی ئەو میراتگرەی ماف گەڕاندنەوەی نیە: كە ژنەكەیە، یان مێردەكەیە (إِلَيْهِ مِنْ مَخْرَجِهِ يُؤَدَّى) هەر لە لێدەرچووەكەی بەشەكەی خۆی دەیدرێتێ، واتە: نیوە، یان چوارێك، یان هەشتێكی دەدرێتێو (ثُمَّ لأَهْلِ الرَّدِّ بَاقِيهِ مُنِحْ) ئینجا پاشماوەكەیشی دەدرێتە ئەو خاوەن بەشانەی میراتە زێدەكەیان بۆ دەگەڕێندرێتەوە، ئینجا تەماشا دەكەین: ئەو پاشماوەیەش هەندێ جار بەساغی بەش دەبێو، هەندێ جاریش بە ساغی بەش نابێ.

فَذَلِكَ الْمَخْرَجُ أَصْلُ الْمَسْئَلَةْ ٣٧٧ كَعِرْسِ مَيْتٍ وَالْبَنَاتُ السَّبْعِ لَهْ
وَكَحَلِيلِ امْرَأَةْ قَدْ قُبِرَتْ ٣٧٨ مَعَ بَنَاتٍ فِي ثَلاَثٍ حُصِرَتْ
إِلاَّ ضَرَبْتَ وِفْقَهَا أَوْ كُلَّهَا ٣٧٩ فِي الْمَخْرَجِ السَّابِقِ ثُمَّ مَا انْتَهَى
إِلَيْهِ هَذَا الضَّرْبُ أَيْ مَا وَصَلَهْ ٣٨٠ فَإِنَّهُ يُجْعَلُ أَصْلَ الْمَسْئَلَةْ
كَزَوْجٍ مَنْ يُدْرِكُهَا الْوَفَاةُ ٣٨١ مَعَ خَمْسٍ أَوْ سِتٍّ هِيَ الْبَنَاتُ

---

**یەكەم:** (فَقَسْمُهُ عَلَى الرُّؤُسِ إِنْ يَصِحّ) ئەگەر پاشماوەكەش بە ساغی بەسەر ژمارەی سەری خاوەن بەشەكاندا بەش دەبوو، ئەوە (فَذَلِكَ الْمَخْرَجُ أَصْلُ الْمَسْئَلَة) هەر لێدەرچووەكەی بەشی ژنەكەو بەشی مێردەكە دەبێتە بنچینەی مەسەلەكە (كَعِرْسِ مَيْتٍ وَالبَنَاتِ السَّبْعِ لَهْ) وەكو ژنێكی مردووەكەو حەفت كیژی مردووەكە، بنچینەی مەسەلەكە لە هەشتە -كە بەشی ژنەكەی لێ دەردەچێ-: هەشتێكی -یەكە- بۆ ژنەكەو، پاشماوەكەیشی -حەفتە- بۆ حەفت كیژەكان، هەم (وكَحَلِيلِ امْرَأَةٍ قَدْ قُبِرَتْ مَعَ بَنَاتٍ فِي ثَلاَثٍ حُصِرَتْ) وەكو مێردی ژنە مردووەكەو سێ كیژیشی، مەسەلەكە لە چوارە -كە بەشی مێردەكەی لێ دەردەچێ-: چوارێكی -یەكە- بۆ مێردەكەو، پاشماوەكەیشی -سێیە- بۆ سێ كیژەكان.

**دووەم:** (إِلاَّ) ئەگەر پاشماوەكە بە ساغی بەسەر سەرەكاندا بەش نەدەبوو، ئەو كاتە (ضَرَبْتَ وِفْقَهَا) یان (وِفق)ی سەری خاوەن بەشەكان لە لێدەرچووەكەی بەشی ژن و مێردەكە بدە -ئەگەر سەرەكان و پاشماوەكە- (مُتَوافِقْ) بوون- (أَوْ كُلَّهَا فَي الْمَخْرَجِ السَّابِقِ) یان تەواوی سەری خاوەن بەشەكان لە لێدەرچووەكەی بەشی ژن و مێردی ڕابردوو بدە -ئەگەر (مُتَبايِن) بوون- (ثُمَّ) ئینجا تەماشا بكە لە هەردوو حاڵەتدا (مَا انْتَهَى إِلَيْه هَذَا الضَّرْبُ أَيْ مَا وَصَلَهُ) كۆی ئەو لێدانە گەیشتە كام ژمارە، ئەوە (فَإِنَّهُ يُجْعَلُ أَصْلَ الْمَسْئَلَة) ئەو ژمارەیە دەكرێتە بنچینەی مەسەلەكە، واتە: لەو ژمارەیە ساغ دەبێتەوە.

**وێنەی (تَبايُن):** (كَزَوْجٍ مَنْ يُدْرِكُهَا الْوَفَاةُ مَعَ خَمْسٍ) وەكو مێردی ژنە مردووەكە لەگەڵ پێنج كیژ، مەسەلەكە لە چوارە -كە بەشی مێردەكەی لێ دەردەچێ-: چوارێكی -یەكە- بۆ مێردەكەو، پاشماوەكەش -سێیە- بەسەر پێنج كیژەكاندا بەش نابێ و، سێ لەگەڵ پێنج (مُتَبايِن)ن، كەوابوو: ژمارەی سەری كیژەكان -كە پێنجە- لە لێدەرچووەكەی بەشی مێردەكە دەدەین -كە چوارە- بنچینەی مەسەلەكە دەبێتە بیست: پێنج بۆ مێردەكەو، پانزەش بۆ پێنج كیژەكان.

فَخَمْسَةٌ أَوْ ثُلْثُ سِتٍّ يُضْرَبُ ٣٨٢ فِي مَخْرَجِ الرُّبْعِ ثُمَّ يُحْسَبُ

وَإِنْ وَجَدْتَ مَنْ عَلَيْهِ لاَ يُرَدّْ ٣٨٣ مَعَ أَهْلِ رَدٍّ فَوْقَ صِنْفٍ اتَّحَدْ

فَفَرْضُ مَنْ رَدٌّ عَلَيْهِ يَمْتَنِعْ ٣٨٤ إِلَيْهِ مِنْ مَخْرَجِ فَرْضِهِ دُفِعْ

إِن اسْتَقَامَ قِسْمَةُ الْبَاقِي عَلَى ٣٨٥ سِهَامِ مَنْ لِلرَّدِّ قَدْ تَأَهَّلاَ

وَهِيَ الَّتِي تُجْعَلُ أَصْلَ الْمَسْئَلَةْ ٣٨٦ لَوْ لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ مَنْ لاَ رَدَّ لَهْ

---

**وێنەی (تَوافُق):** (أَوْ سِتّ هِيَ البَنَاتُ) یان وەکو مێردو شەش کیژ: دیسان مەسەلەکە لە چوارە –کە بەشی مێردەکەی لیٚ دەردەچیٚ–: چوارێکی –یەکە– بۆ مێردەکەو، پاشماوەکەیشی –سیٚیە– بەسەر شەش کیژەکاندا بەش نابیٚو سیٚ لەگەڵ شەشە (مُتَوَافِق)ن بە سێیەك، کەوابوو: (فَخَمْسَةٌ) پێنج –کە ژمارەی سەری کیژەکان بوو– لە وێنەی (تَبايُن)داو (أَوْ ثُلْثُ سِتّ) یان سێیەکی شەش کیژەکان –کە دووە– لە وێنەی (تَوافُق) دا (يُضْرَبُ فِي مَخْرَجِ الرُّبُعِ) لە لێدەرچووی چوارێك دەدریٚ –کە چوارە– (ثُمَّ يُحْسَبُ) ئینجا حیساب دەکریٚ، واتە: لێرەشدا بنچینەی مەسەلەکە دەگاتە هەشت: دوو بۆ مێردەکەو، شەشیش بۆ شەش کیژەکان.

**بەشی چوارەم:** خاوەن بەشەکان لەیەك جۆر زیاتر بن، بەڵام ژن، یان مێرد لەگەڵدا بیٚ (وَإِنْ وَجَدْتَ مَنْ عَلَيْهِ لاَ يُرَدّ) ئەگەر میراتگری وەهات دەست کەوت کە میراتەکەی بۆ ناگەڕێندرێتەوە، واتە: ژن، یان مێرد هەبوو (مَعَ أَهْلِ رَدّ) لەگەڵ ئەو میراتگرانەی میراتە زێدەکەیان بۆ دەگەڕاندراوەو (فَوْقَ صِنْفٍ اتَّحَدْ) لە جۆرێکیش زیاتر بوون، واتە: دوو جۆرە بەشە میرات، یان زیاتریان دەگرت، ئەو کاتەش (فَفَرْضُ مَنْ رَدٌّ عَلَيْهِ يَمْتَنِعُ) بەشە میراتی ئەو میراتگرەی گەڕاندنەوەی لیٚ قەدەغەیە: کە ژنەکەیە، یان مێردەکەیە (إِلَيْهِ مِنْ مَخْرَجِ فَرْضِهِ دُفِعَ) هەر لێدەرچووی بەشەکەی خۆی دەیدرێتیٚ، هەروەك لە بەشی سیٚیەمدا ڕابرا، واتە: نیوە، یان چوارێك، یان هەشتێکی دەدرێتیٚو، ئینجا پاشماوەکەش دەدرێتە ئەو خاوەن بەشانەی زێدەکەیان بۆ دەگەڕێندرێتەوە، ئینجا تەماشا دەکەین: ئەو پاشماوەیەش هەندیٚ جار بە ساغی بەش دەبیٚو، هەندیٚ جاریش بەساغی بەش نابیٚ.

**یەکەم:** (إِنِ اسْتَقَامَ قِسْمَةُ الْبَاقِي) ئەگەر ئەو پاشماوەیەی لە دوای بەشی ژنەکە، یان مێردەکە ماوەتەوە بە ساغی بەش دەبوو (عَلَى سِهَامِ مَنْ لِلرَّدِّ قَدْ تَأَهَّلاَ) لەسەر کۆی بەشە میراتەکانی ئەو خاوەن بەشانەی گەڕاندنەوەیان بۆ هەیە (وَهِيَ الَّتِي تُجْعَلُ أَصْلَ

فَذَلِـكَ الْمَخْـرَجُ أَصْـلاً يُجْعَــلُ ٣٨٧ وَالصُّـورَةُ الَّتِــي بِــهَا يُمَثَّــلُ
أَرْبَــعُ جَــدَّاتٍ وَعِـرْسٌ وَاحِــــدَةْ ٣٨٨ وَأَخَــواتٌ سِــتٌّ أَيْ مِـنْ وَالِــدَةْ
إلاَّ فَفِي مَخْــرَجٍ فَـرْضٍ قَــدْ سَـبَقْ ٣٨٩ إِضْرِبْ سِــهَامَ مَــنْ لِـرَدٍّ اسْـتَحَقّْ
فَمَا انْتَــهَى ضَرْبُــكَ أَيْ مَــا وَصَلَــهْ ٣٩٠ هُوَ الَّــذِي يُجْعَــلُ أَصْــلَ الْمَسْــئَلَةْ
مِثْلُ البَنَــاتِ التِّسْـعِ مَــعْ جَـدَّاتِ ٣٩١ سِــتٍّ وَأَرْبَــعٍ مِــنَ الزَّوْجَــاتِ

---

الْمَسْئَلَةْ) ئەو بەشە میراتانەی دەکرانە بنچینەی مەسەلەکە (لَوْ لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ مَنْ لاَ رَدَّ لَهْ) ئەگەر لە مەسەلەکەدا ژنو مێرد نەبووانە –هەروەك لە بەشی دووەمدا ئەوها بوو– ئەو کاتە (فَذَلِكَ الْمَخْرَجُ أَصْلاً يُجْعَلُ) ئەو لێدەرچووەی بەشی ژنەکە، یان مێردەکە –لێرەدا– دەکرێتە بنچینەی مەسەلەکە (وَالصُّورَةُ الَّتِي بِهَا يُمَثَّلُ) ئەو وێنەیەی دەکرێتە وێنەی ئەو حاڵەتە ئەمەیە: (أَرْبَعُ جَدَّاتٍ وَعِرْسٌ وَاحِدَةٌ وَأَخَواتٌ سِتٌّ أَيْ مِنْ وَالِدَةٍ) چوار داپیرە ژنێكو شەش خوشكی لە دایكی، بنچینەی مەسەلەکە لە چوارە –کە بەشی ژنەکەی لیٚ دەردەچیٚ–: چوارێکی –یەکە– بۆ ژنەکەو، پاشماوەکەیشی –سیٚیە– بەسەر کۆی بەشەکانی داپیرەکانو خوشکەکاندا بەش دەبیٚ: کە شەشێکێكو سێیەکێکەو کۆیان دەکاتە سیٚ، کەواتە: یەکێك بۆ داپیرەکانو دوو بۆ خوشکەکان، هەروەك لە بەشی دووەمدا ڕابرا، بەڵام بەشی داپیرەکانو خوشکەکان بەساغی بەسەر سەرەکانیاندا بەش نابیٚو دووبارە مەسەلەکە لە چلو هەشت ساغ دەکرێتەوە، بەو (قاعدة)یەی لەساغ کردنەوەدا ڕابرا.

**دووەم:** (إلاَّ) ئەگەر پاشماوەکە بە ساغی بەسەر کۆی بەشە میراتەکاندا بەش نەدەبوو، ئەو کاتە (فَفِي مَخْرَجٍ فَرْضٍ قَدْ سَبَقَ إِضْرِبْ سِهَامَ مَنْ لِرَدٍّ اسْتَحَقّ) کۆی بەشە میراتەکانی ئەو خاوەن بەشانەی مافی گەڕاندنەوەی میراتەکەیان هەیە لە لێدەرچووەکەی بەشی ژنەکە، یان مێردەکە بدە، ئینجا تەماشا بکە: (فَمَا انْتَهَى ضَرْبُكَ أَيْ مَا وَصَلَهْ) کۆی ئەو لێدانەت گەیشتە کام ژمارە، ئەوە (هُوَ الَّذِي يُجْعَلُ أَصْلَ الْمَسْئَلَةْ) ئەو ژمارەیە دەکرێتە بنچینەی مەسەلەکە (مِثْلُ البَنَاتِ التِّسْعِ مَعْ جَدَّاتٍ سِتّ وَأَرْبَعٍ مِنَ الزَّوْجَاتِ) وەکو نۆ کیژو شەش داپیرەو چوار ژن، مەسەلەکە لە هەشتە –کە بەشی ژنەکانی لیٚ دەردەچیٚ– هەشتێکی –یەکە– بۆ چوار ژنەکانو، پاشماوەکەیشی –حەفتە– بەسەر کۆی بەشە میراتەکانی داپیرەکانو کیژەکاندا بەش نابیٚ: کە

يُبَايِنُ الْخَمْسَةُ سَبْعَ بَاقِيَةْ ٣٩٢ فَتَضْرِبُ الْخَمْسَةَ فِي ثَمَانِيَةْ
إِنْ شِئْتَ تَدْرِي مَا لِكُلِّ فِرْقَةْ ٣٩٣ وَكُلَّ ذِي حَقٍّ تُوَفِّي حَقَّهْ
فَاضْرِبْ سِهَاماً هِيَ لِلْمَحْسُوبِ ٣٩٤ مِنْ غَيْرِ أَهْلِ الرَّدِّ فِي الْمَضْرُوبِ
فَذَاكَ سَهْمُهُ مِنْ أَصْلِ الْمَسْئَلَةْ ٣٩٥ وَاضْرِبْ سِهَامَ مَنْ يَكُونُ الرَّدُّ لَهْ
فِيمَا بَقِي مِنْ مَخْرَجٍ تَقَدَّمَا ٣٩٦ وَحَاصِلُ الضَّرْبِ إِلَيْهِ سُلِّمَا
وَإِنْ عَلَى البَعْضِ أَوِ الْجَمِيعِ ٣٩٧ تَنْكَسِرُ السِّهَامُ فِي التَّوْزِيعِ

---

شەشیێكو دوو سێیەكەو، كۆیان دەكاتە پێنج، جا (يُبَايِنُ الْخَمْسَةُ سَبْعَ بَاقِيَةْ) ئەو بنچینەی كۆی بەشی داپیرەكانو كیژەكانە (مُتَباين)ە لەگەڵ حەفتەكەی پاشماوەكە، كەوابوو: (فَتَضْرِبُ الْخَمْسَةَ فِي ثَمَانِيَةٍ) پێنجەكەی بەشە میراتەكان لە لێدەرچووەكەی بەشی ژنەكە دەدەین -كە هەشتە- بنچینەی مەسەلەكە دەبێتە چل:

ئینجا هەر كاتێك ساغكردنەوەكەت تەواو كرد (إِنْ شِئْتَ تَدْرِي مَا لِكُلِّ فِرْقَةٍ) ئەگەر حەزت كرد بزانی -لە كۆی مەسەلەكە- گشت كۆمەڵێك چەندی هەیەو (وَكُلَّ ذِي حَقٍّ تُوَفِّي حَقَّهُ) گشت خاوەنە مافێك مافەكەی بە تەواوی بدەیێ، ئەوە (فَاضْرِبْ سِهَاماً هِيَ لِلْمَحْسُوبِ مِنْ غَيْرِ أَهْلِ الرَّدِّ فِي الْمَضْرُوبِ) بەشە میراتەكانی ژنەكە، یان مێردەكە لەو ژمارەیە بدە: كە لە لێدەرچووی بەشەكەت دابوو (فَذَاكَ سَهْمُهُ مِنْ أَصْلِ الْمَسْئَلَة) كۆی لێدانەكە دەبێتە بەشی وی لە بنچینەی مەسەلەكە بۆ وێنە: لە مەسەلەكەی ڕابردوودا: بەشی چوار ژنەكان یەك بوو، لەو پێنجەی بدە: كە كۆی بەشە میراتەكان بووو لە لێدەرچووی بەشی ژنەكانت دابوو، ئەو كاتە بەشی ژنەكان -لە چلەكە- دەبێتە پێنج، هەروەها (وَاضْرِبْ سِهَامَ مَنْ يَكُونُ الرَّدُّ لَهُ) بەشەكانی ئەو میراتگرانەی میراتە زێدەكەیان بۆ دەگەڕێندرێتەوە، ئەوانیش (فِيمَا بَقِي مِنْ مَخْرَجٍ تَقَدَّمَا) لەو پاشماوەیە بدە: كە لە پاش لێدەرچووەكەی ژنەكە، یان مێردەكەی ڕابردوو مابۆوە (وَحَاصِلُ الضَّرْبِ إِلَيْهِ سُلِّمَا) كۆی لێدانەكە چەند بوو تەسلیمی میراتگرەكە دەكرێ، بۆ وێنە: لە مەسەلەكەی ڕابردوودا: داپیرەكان یەكیان هەبوو، لە حەفتەكەی پاشماوەكەی بدەو، لە چلەكە بەشیان دەبێتە حەفت، هەروەها كیژەكانیش چواریان هەبوو، لە حەفتەكەی پاشماوەكەی بدەو لە چلەكە بەشیان دەبێتە بیستو هەشت.

(وَإِنْ عَلَى البَعْضِ أَوِ الْجَمِيعِ) جا ئەگەر لە دوای دیار كردنی بەشە میرات، لەسەر هەندێكی سەری میراتگرەكاندا، یان لەسەر سەری هەموانیاندا (تَنْكَسِرُ السِّهَامُ فِي

فَبِــأُصُولٍ ذُكِــرَتْ مُفَصَّلَــــةْ٣٩٨ تُعْمَلُ فِـــي تَصْحِيــحِ كُــلِّ مَسْــئَلَةْ الْمُنَاسَخَات

فَــرْعٌ: أُبَيِّـــنُ الْمُنَاسَـــخَات٣٩٩ فِيــهِ وَتَنْتَــهِي بِــهَا أَبْيَــاتِي

قُبِــضَ عَــنْ وَرَثَــةٍ ثُـــمَّ هَلَــكْ٤٠٠ أَحَدُهُمْ مِـــنْ قَبْــلِ قَسْــمِ مَــا تَــرَكْ

إِنْ تَنْحَصِــرْ وَرَثَــةٌ فِيمَــنْ بَقِــي٤٠١ وَوَرِثُــوهُ إِرْثَـــهُمْ مِـــنْ سَــابِقِ

---

التَّوْزِيعِ) بەشە میراتــەكان دەشكانەوەو بە ساغی بەسەریاندا بەش نەدەبوون، ئـەو كاتەش (فَبِأُصُولٍ ذُكِرَتْ مُفَصَّلَةً) بەو (قاعدة) ڕابردووانەی بە درێژی لە ساغ كردنەوەی مەسەلەكاندا باس كرابوون (تُعْمَلُ فِـي تَصْحِيحِ كُـلِّ مَسْئَلَةْ) ڕەفتار دەكرێ لەساغ كردنەوەی كش مەسەلەیەكیش لێرەدا، كەواتــە: لـە مەسـەلەكەی ڕابردوودا بەشـەكانی ژنـەكانو داپیرەكـانو كیژەكـان گشـتیان لەگـەڵ سـەری خاوەنـەكانیان (مُتَبـاين)ن، كەوابوو: سەرەكان وەكو خۆیـان دەهێشـترێنەوە، ئینجـا ژمـارەی سـەری داپیرەكـانو سەری ژنەكان (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، كەوابوو: نیوەی سەری ژنەكان لە تەواوی سەری داپیرەكـان دەدەیـنو دەبێتـە دوانـزە، ئـەم دوانزەیـەش لەگـەڵ ژمـارەی نۆ كیژەكـان (مُتَوَافِق)ن بە سێیەك، كـەوابوو: سـێیەكی نـۆ –كـە سـێیە– لـەم دوانزەیـە دەدەیـنو دەكاتە سیو شەش، ئەم سیو شەشە دەبێتە (جُزْءُ السَّهْم)و لە چلەكـەی مەسـەلەكەی دەدەدەینو لە (١٤٤٠) هەزارو چوار سەدو چل ساغ دەبێتـەوە: (١٨٠) سـەدو هەشـتا بـۆ ژنـەكانو، (٢٥٢) دووسـەدو پـەنجاو دوو بۆ داپیرەكـانو، (١٠٠٨) هـەزارو هەشـت بـۆ كیژەكان.

## ﴿فَرْعٌ: لە باسی (الْمُنَاسَخَات): گواستنەوەی میرات لە مردوویێك بۆ مردوویێكی تر﴾

واتە: پێش بەشكردنی میراتەكە یەكێك لە میراتگرەكـان بمـرێ (أُبَيِّـنُ الْمُنَاسَـخَاتِ فِيـهِ) ئەوە لەم هۆنراوەمدا باسی گواسـتنەوەی مـیرات لـە مردوویێك بۆ مردوویێكـی تـر ڕوون دەكەمەوەو (وَتَنْتَهِي بِهَا أَبْيَاتِي) بە كۆتایی ئـەم باسـەش كۆتـایی بـە شـیعرەكانم دێ، هەر كاتێك (قُبِضَ عَنْ وَرَثَةٍ) یەكێك مردو، كۆمەڵە مـیراتگرێكی لـە پـاش بـەجێمان (ثُـمَّ هَلَكَ أَحَدُهُمْ مِنْ قَبْلِ قَسْمِ مَا تَرَكَ) ئینجا پێش بەشكردنی میراتەكە یەكێكیان مرد، ئەوە تەماشـا دەكـەین: (إِنْ تَنْحَصِـرْ وَرَثَـةٌ فِيمَـنْ بَقِـي) ئەگــەر میراتگرەكـانی مردووەكـەی دووەمیش تەنها هەر میراتگرەكانی مردووەكەی یەكەم بوونو (وَوَرِثُوهُ إِرْثَهُمْ مِنْ سَابِقِ)

يُجْعَلْ كَأَنَّ الْمَيِّتَ الثَّانِيَ مَا ٤٠٢ كَانَ وَالإِرْثُ بَيْنَهُمْ قَدْ قُسِمَا
كَإِخْوَةٍ وَأَخَوَاتٍ لاَ لأُمّ ٤٠٣ مَاتَ عَنِ البَاقِينَ مِنْهُمْ بَعْضُهُمْ
إلاَّ فَمَسْئَلَةُ كُلٍّ مِنْهُمَا ٤٠٤ قَدْ صُحِّحَتْ: فَإِنْ يَكُنْ مُنْقَسِمَا
مَا كَانَ لِلثَّانِي مِنَ الأُولَى عَلَى ٤٠٥ مَسْئَلَةٍ تَخُصُّهُ قَدْ سَهُلا

---

ميراتگرتنەكەشیان لە مردووەكەی دووەم وەك میراتگرتنیان لە مردووەكەی یەكەم بوو، ئەوە بۆ دروست كردنی مەسەلەكە (يُجْعَلْ كَأَنَّ الْمَيِّتَ الثَّانِيَ مَا كَانَ) وا دادەندرێ: كە مردووەكەی دووەم لەگەڵ میراتگرەكانی مردووەكەی یەكەمدا نەبووەو (وَالإِرْثُ بَيْنَهُمْ قَدْ قُسِمَا) میراتەكە لە نێوان ئەم میراتگرانەدا بەش دەكرێ: كە ئێستا ماون: (كَإِخْوَةٍ وَأَخَوَاتٍ لاَ لأُمّ) وەكو برایەكانو خوشكەكانی لە باوكیی مردووەكە (مَاتَ عَنِ البَاقِينَ مِنْهُمْ بَعْضُهُمْ) پێش بەشكردنی میراتەكە هەندێكیان مردبنو هەندێكیش مابن، ئەوە وا دادەندرێ مردووەكەی دووەم هەر نەبووەو ژمارەی ئەو میراتگرانەی ئێستا ماون دەبێتە بنچینەی مەسەلەكە. هەم وەكو لە كوڕەكانو كیژەكانی مردووەكە -پێش بەشكردنی میراتەكە- یەكێكیان بمرێ، لێرەشدا هەرچەند كوڕەكانو كیژەكان دەبنە خوشكو برای مردووەكەی دووەم بەڵام هەر ژمارەكەیان دەبێتە بنچینەی مەسەلەكەو، وا دادەندرێ مردووەكەی دووەم هەر نەبووە.

(إلاَّ) بەڵام ئەگەر میراتگرەكانی مردووەكەی دووەم تەنها هەمان میراتگرەكانی مردووەكەی یەكەم نەبوون، بەڵكو: یان میراتگری تریش هاوبەشییان لەگەڵ دەكردن، یان میراتەكە تەنها بۆ هەندێك میراتگری تری جگە لەوان بوو، یان هەر بۆ ئەوان بوو بەڵام ئەندازەی میراتەكەیان لە مردووەكەی یەكەمو دووەم جیاواز بوو، ئەوە لە هەرسێك حاڵەتدا (فَمَسْئَلَةُ كُلٍّ مِنْهُمَا قَدْ صُحِّحَتْ) مەسەلەی مردووەكەی یەكەمو مەسەلەی مردووەكەی دووەم هەردووكیان ساغ دەكرێنەوە، ئینجا كە هەردوو مەسەلەكانت ساغ كردنەوە، تەماشا بكە:

(فَإِنْ يَكُنْ مُنْقَسِماً مَا كَانَ لِلثَّانِي) ئەگەر ئەو بەشە میراتەی مردووەكەی دووەم -كە (مِنَ الأُولَى) لە مەسەلەی یەكەم گرتبووی- بە ساغی بەش دەبوو (عَلَى مَسْئَلَةٍ تَخُصُّهُ) بەسەر ئەو مەسەلە دووەمەی تایبەتە بە خۆی، ئەوە (قَدْ سَهُلاَ) كاری گواستنەوەكە ئاسانەو ئاشكرایە: وەك مێردو دوو خوشكی لە باوكیی لە پاش بەجێ بمێنێ، ئینجا لەو دوو خوشكانەش -پێش بەشكردنی میراتەكە- خوشكێكیان بمرێو، خوشكەكەی

إلاَّ فَـإنْ تَبَايَنـــا فِـــي الأُولَـــى ٤٠٦ ضرَبْـــتَ مَسْـــــئلَتَهُ، وَإلاَّ
فَوِفْقَـهَا ضَرَبْتَـــهُ فِيـــهَا فَمَـــا ٤٠٧ بَلَــغَ مِنْــهُ صَحَّتَـــا كِلْتَاهُمَـــا
وَمَنْ مِنَ الْمَسْـــئَلَةِ الأُولَـــى يُصِيـــبْ ٤٠٨ شَيْئاً فَفِي الْمَضْرُوب فِيهَا قَدْ ضُـــرِبْ
فَـذَاكَ سَـهْمُهُ وَمَـــنْ يُصِيـــبُ ٤٠٩ شَيْئاً مِـنَ الأُخْـرَى فَـذَا مَضْـرُوبُ

---

ترو كیژێكی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئەوە مەسەلەكەی یەكەم لە شەشە -بە لێدانی دوو لە سێ- كە بەشی مێردەكەو خوشكەكانیان لێ دەردەچێ- جا (عَوْل) دەكرێ بۆ حەفت: بەشی خوشكە مردووەكە لە مەسەلەكەی یەكەم دوو بوو -چونكە بە هەردوو خوشكەكان دوو سێیەكیان گرتبوو -كە چوارە- دووەكەش بەسەر مەسەلەكەی خۆی دابەش دەبێ، كەواتە: بەشەكەی مردووەكەی دووەم -كە دووەو لە مەسەلەكەی یەكەم گرتبووی- یەكسەر دەدرێتە میراتگرەكانی خۆی: یەكێك بۆ كیژەكە بە خاوەن بەشیی، یەكەكەی تریش بۆ خوشكەكە بە (عَصَبَة)یی.

(إلاَّ) بەلاَم ئەگەر بەشە میراتەكەی مردووەكەی دووەم -كە لە مردووەكەی یەكەم گرتبووی- بەسەر مەسەلەكەی خۆیدا بەش نەدەبوو، ئەو كاتەش تەماشا بكە: (فَإنْ تَبَايَنا) ئەگەر مەسەلەكەو بەشە میراتەكەی مردووەكەی دووەم (مُتَبايِن) بوون، ئەو كاتە (فِي الأُولَـى ضرَبْـتَ مَسْئَلَتَهُ) تەواوی مەسەلەی مردووەكەی دووەم لە تەواوی مەسەلەی مردووەكەی یەكەم بدە (وَإلاَّ) بەلاَم ئەگەر (مُتَبايِن) نەبوون، بەڵكو مەسەلەكەو بەشەكەی مردووەكەی دووەم (مُتَوافِق) بوون (فَوِفْقَهَا ضَرَبْتَهُ فِيهَا) ئەو كاتە (وِفْق)ی مەسەلەی دووەمەكە لە تەواوی مەسەلەی یەكەمەكە بدە، ئینجا لە هەردوو حاڵەتی لێكدانەكاندا (فَمَا بَلَغَ) كۆی لێدانەكە گەیشتە كام ژمارە، ئەوە (مِنْهُ صَحَّتَا كِلْتَاهُمَـا) هەردوو مەسەلەی یەكەمەكەو دووەمەكە لە كۆی ئەو لێدانە ساغ دەبنەوە.

(وَ) هەر كاتێك هەردوو مەسەلەكان لە ژمارەیەك ساغ بوونەوە، ئەو كاتە بۆ بەشكردنی میراتی هەردوو مردووەكان بڵێ: (مَنْ مِنَ الْمَسْئَلَةِ الأُولَى يُصِيبُ شَيْئاً) هەر میراتگرێك -جگە لە مردووەكە- بەشە میراتێكی لە مەسەلەی یەكەم هەیە، ئەوە (فَفِي الْمَضْرُوب فِيهَا قَدْ ضُرِبَ) كە بەشە میراتەكەی دەگرێ لەو ژمارەیە دەدرێ: كە لە مەسەلەكەی یەكەم درابوو -كە (وِفْق)ی مەسەلەكەی دووەم بوو، یان تەواوەكەی بوو- ئینجا كۆی لێدانەكە گەیشتە كام ژمارە (فَذَاكَ سَهْمُهُ) ئەوە بەشی ئەو میراتگرەیە: لە كۆی هەردوو

فِيمَا مِـــنَ الأُولَـى أَصَـابَ الثَّـانِي ٤١٠ مِـــنْ حِصَّتِــــهْ إِذْ يَتَبَايَنَــــــان
أَوْ وِفْقِـهِ إِنْ وافَقَتْــــهُ الْمَسْـــئَلَةْ ٤١١ وَحَاصِلُ الضَّرْبِ هُــوَ النَّصِيــبُ لَــهُ
وَمَثَّلُــوا تَبَايُنــــاً: بِمَيْــــتٍ ٤١٢ مُخَلِّـــفٍ لِزَوْجَـــــةٍ وَبِنْـــــتٍ
مَـــعَ ثَلاَثَـــةِ بَنِــــينَ وَحَضَـــرْ ٤١٣ وَفَـــاةُ بِنْـــتٍ عَـــنْ أُولاَئِــكَ النَّفَـــرْ
وَالْعِـرْسُ هَاهُنَــا تُكُــونَ وَالِـــدَةْ ٤١٤ كَـذَا الْبَنُـونَ إِخْـــوَةٌ لِلْبَـــائِدَةْ.
فَــإِنَّ الأُولَــى هِــيَ مِــنْ ثَمَانِيَــــةْ ٤١٥ مِــنْ ضِعْــفِ تِسْعَةٍ تَصِحُّ الثَّانِيَــةْ
فَضِعْفُ تِسْعٍ فِي ثَمَــانٍ قَــدْ ضُـرِبْ ٤١٦ وَمُنْتَــهَاهُ (قَــدَمٌ) إِذَا حُسِــبْ

---

مەسەلەکان (وَ) هەروەها (مَنْ يُصِيبُ شَيْئاً مِنَ الأُخْرَى) هەر میراتگرێك بەشە میراتێکی لە مەسەلەکەی دووەم هەیە، ئەوە (فَذَا مَضْرُوبٌ فِيمَا مِنَ الأُولَى أَصَابَ الثَّانِي) کە بەشە میراتەکەی دەگرێ لە تەواوی بەشی مردووەکەی دووەم دەدرێ: کە لە یەکەمەکە گرتبووی (مِنْ حِصَّتِهِ إِذْ يَتَبَايَنَانِ) لە بەشەکەی خۆی ئەگەر بەشەکەی‌و مەسەلەکەی (مُتَبايِن) بن (أَوْ وِفْقِهِ) یان بەشە میراتەکە لە (وِفْق) بەشی مردووەکەی دووەم دەدرێ (إِنْ وافَقَتْهُ الْمَسْئَلَةْ) ئەگەر مەسەلەی دووەمەکە (مُتَوافِق) بێ لەگەڵ بەشەکەی، ئینجا (وَحَاصِلُ الضَّرْبِ) کۆی لێدانەکە (هُوَ النَّصِيبُ لَهُ) بەشی ئەو میراتگرەیە لە کۆی هەردوو مەسەلەکان. ئینجا ئاگادار بە: لە کۆی مەسەلەکان بەشی مردووەکە دامەنێ.

١- (**وَمَثَّلُوا تَبَايُناً**) وێنەیان بۆ (تَبايُن) هێناوە: (بِمَيْتٍ) بە مردوویێکی وەها: کە (مُخَلِّفٍ لِزَوْجَةٍ وَبِنْتٍ مَعَ ثَلاَثَةِ بَنِينَ) ژنێك‌و کیژێك‌و سێ کوڕی لەپاش بەجێ بمێنێ، ئینجا پێش بەشکردنی میراتەکە (وَحَضَرَ وَفَاةُ بِنْتٍ عَنْ أُولاَئِكَ النَّفَرِ) کیژەکە مردو، هەر ئەو میراتگرانەی تازەی لەپاش بەجێمان، بەڵام (وَالْعِرْسُ هَاهُنَا تُكُونَ وَالِدَةً) لە دووەمەکەدا: ژنەکە دەبێتە دایکی کیژە مردووەکەو (كَذَا الْبَنُونَ إِخْوَةٌ لِلْبَائِدَةِ) هەروەها کوڕەکانیش دەبنە برای کیژە مردووەکە (فَإِنَّ الأُولَى هِيَ مِنْ ثَمَانِيَةٍ) جا مەسەلەکەی یەکەم لە هەشتەو، دووەمەکەش لە شەشە، بەڵام (مِنْ ضِعْفِ تِسْعَةٍ تَصِحُّ الثَّانِيَةُ) دووەمەکە لە دوو هەندی نۆ، واتە: لە هەژدە ساغ دەبێتەوە: بەشی کیژە مردووەکە لە مەسەلەکەی یەکەم تەنها یەك بوو، کەواتە: بەشی کیژە مردووەکە لەگەڵ مەسەلە دووەمەکەی خۆی -کە هەژدەیە- (مُتَبايِن)ن، کەوابوو: (فَضِعْفُ تِسْعٍ) هەژدە -کە تەواوی مەسەلەکەی دووەمە- (فِي ثَمَانٍ قَدْ ضُرِبَ) لە هەشت دەدرێ -کە تەواوی

وَلتَوَافُـــقِ: بِـــذِي وَفَـــاة ٤١٧ عَـــنْ أَخَـــوَاتٍ مُتَفَرِّقَـــاةٍ
هُـنَّ ثَـلاثٌ مَـعَ جَدَّتَيْـنِ ثُـــمَّ ٤١٨ عَـنْ أُمِّ أُمٍّ مَـــاتَتِ الأُخْـــتُ لأُمّْ
وَالأُخْـــتِ مِـنْ أُمٍّ وَأُخْتَيْـنِ هُمَـــا ٤١٩ مِـنْ وَالِـدٍ مِـنْ سِتَّةٍ أَصْلُــهُمَا
مِنْ ضِعْفِهَا تَصِـحُّ الأُولَـى فَضُـرِبْ ٤٢٠ ثَلاثَةٌ فِـــي ضِعْـفِ سِتٍّ وَحُسِـبْ

---

مەسەلەکەی یەکەمە- (وَمُنْتَهَاهُ (قَدَمٌ) إِذَا حُسِبَ) لە کۆی لێدانەکە: -کـە سـەدو چڵو چوارە- مەسەلەکان ساغ دەبنەوە. **بزانە:** بە گوێرەی (أبجد) پیتەکانی (قَدَم) دەکاتە سەدو چڵو چوار: ژنەکە لـە یەکەمەکـە یـەکی هـەبووو لـە هەژدەکـە دەدرێو لـە کۆی هەردوو مەسەلەکان بەشی دەبێتە هەژدە، هەم لـە دووەمەکـەش بـە دایکایـەتی سـێی هەبووو لە بەشی کیژە مردووەکە دەدرێ -کە یەکە-و، ئـەمجارەش لـە کۆی هـەردوو مەسەلەکان بەشی هەر دەبێتە سـێ. هـەر کوڕێکیـش لـە سـێ کوڕەکـان لـە یەکەمەکـە دووی هەبووو لە هەژدەکـە دەدرێو لـە کۆی هـەردوو مەسـەلەکان بەشـی هـەر یـەکێك دەبێتە سیو شەش، هەم لە دووەمەکەش بە برایـەتی هـەر یەکـەو پێنجی هـەبووو لـە بەشی کیژە مردووەکە دەدرێ -کە یەکە-و، ئەمجارەش بەشی هەر یەکێکیان لە کۆی هەردوو مەسەلەکە هەر دەکاتە پێنج.

٢- (**وَلتَوَافُقِ**) وێنەیان بۆ (تَوافُق) هێناوە: (بِذِي وَفَاةٍ) بـە مردووێکـی وەهـا: کـە (عَنْ أَخَوَاتٍ مُتَفَرِّقَاةٍ هُنَّ ثَلاَثٌ مَعَ جَدَّتَيْنِ) دوو داپیرەو سێ خوشکی لە پـاش بـەجێ بمێنـێ: یەکێکیان لە دایکی، یەکێکیان لە باوکی، یەکێکیان لە دایکیو باوکی (ثُمَّ) ئینجـا پێش بەشکردنی میراتەکە (عَنْ أُمِّ أُمٍّ مَاتَتِ الأُخْتُ لأُمّ) خوشکە لە دایکیەکە مردو، لە پاشی بەجێما: دایکی دایك -کە یەکێك لە دوو داپیرەکانە-و (وَالأُخْتِ مِنْ أُمّ) خوشـکێکی لـە دایکی -کە خوشکە لە دایکیو باوکیەکەیە-و (وَأُخْتَيْنِ هُمَا مِنْ وَالِدٍ) هەم دوو خوشکی لە باوکیشی -کە لەیەکەمەکـەدا نـەبوون- (مِنْ سِتَّةٍ أَصْلُهُمَا) بنچینـەی مەسـەلەکەی یەکەمو دووەم لە شەشە، بەڵام (مِنْ ضِعْفِهَا تَصِحُّ الأُولَى) یەکەمەکـە لـە دوو هـەندی شەش، واتە: لە دوانزە ساغ دەبێتەوە، ئینجا بەشی خوشکە مردووەکـە لـە یەکەمەکـە دوو بووو لەگەڵ مەسەلە دووەمەکەی خۆی (مُتَوَافِق)ن بە نیوەیی، کـەوابوو: (فَضُرِبَ ثَلاَثَةٌ فِي ضِعْفِ سِتّ) سێ -کە نیـوەی مەسـەلەکەی دووەمـە- لـە تـەواوی یەکەمەکـە دەدرێ -کە دوانزەیـە- (وَحُسِبَ) کۆی لێدانەکـە حیسـاب دەکرێو لـە سـێو شـەش مەسەلەکان ساغ دەبنەوە.

ئینجا هەر داپیرەیەك لە یەكەمەكە یەكی هەبوو، كەوابوو: یەكەكەی هەر داپیرەیەك لە سێیەكە دەدرێ‌و لە كۆی هەردوو مەسەلەكان: هەر داپیرەیەك بەش دەبێتە سێ، هەم داپیرەكەی مەسەلەكەی دووەمیش لە دووەمەكە یەكی هەبووو، لە (وِفْق)ی بەشی خوشكە مردووەكە دەدرێ‌و بەشی ئەم داپیرە ئەمجارەش لە كوێ هەردوو مەسەلەكان هەر دەبێتە یەك. خوشكە لە دایكی‌و باوكیەكەش لە یەكەمەكە شەشی گرتبووو لە سێیەكە دەدرێ‌و لە كۆی هەردوو مەسەلەكان بەشی دەبێتە هەژدە، هەر ئەم خوشكەش لە دووەمەكە یەكێكی گرتبووو لە (وِفْق)ی بەشی خوشكە مردووەكە دەدرێ‌و ئەمجارەش لە كوێ هەردوو مەسەلەكان بەشی هەر دەبێتە یەك. خوشكە لە باوكیەكەش لە یەكەمەكە دووی گرتبووو لە سێیەكە دەدرێ‌و لە كۆی هەردوو مەسەلەكان بەشی دەبێتە شەش، بەلام لە دووەمەكە هیچی نیە، دوو خوشكە لە باوكیەكانیش لە دووەمەكە چواریان هەبووو لە (وِفْق)ی بەشی خوشكە مردووەكە دەدرێ‌و لە كۆی هەردوو مەسەلەكان بەشیان هەر دەبێتەوە چوار، بەلام لە یەكەمەكە هیچیان نەبوو.

**ئینجا بزانە:** ئەگەر میراتگرێكی سێیەمیش مرد، ئەو كاتە ئەو ژمارەیەی هەردوو مەسەلەكانی لێ ساغ بوونەتەوە: وەك مەسئەلەیەكی یەكەم دادەندرێ‌و، مەسەلەكەی مردووەكەی سێیەمیش وەك مەسەلەكەی دووەم دادەندرێ، كەواتە: ئەگەر بەشی مردووەكەی سێیەم كە لە كۆی یەكەمەكەو دووەمەكە گرتبووی بەسەر مەسەلەكەی سێیەمدا بەش دەبوو، ئەوە ئاسانە، بەلام ئەگەر بەش نەدەبوو، تەماشا بكە: ئەگەر بەشی سێیەمەكەو مەسەلە سێیەمەكە (مُتَبايِن) بوون، ئەوە تەواوی سێیەمەكە لە كۆی یەكەمەكەو دووەمەكە بدە، وە ئەگەر بەشی سێیەمەكە و مەسەلە سێیەمەكە (مُتَوافِقْ) بوون، ئەو كاتە (وِفْق)ی سێیەمەكە لە كۆی یەكەمەكەو دووەمەكە بدە، ئینجا لە هەردوو حالەتدا كۆی لێدانەكە گەیشتە كام ژمارە، ئەوە لەو ژمارەیە هەرسێكیان ساغ دەبنەوە، ئینجا هەر میراتگرێك لە كۆی یەكەمەكەو دووەمەكە بەشە میراتێكی هەبێ، ئەوە كە وەری دەگرێ: لە (وِفْق)ی سێیەمەكە دەدرێ ئەگەر (مُتَوافِق) بووبێ، یان لە تەواوی سێیەمەكە دەدرێ ئەگەر (مُتَبايِن) بووبێ، وە هەر میراتگرێكیش لە سێیەمەكە بەشی هەبێ، ئەوە كە وەری دەگرێ لە تەواوی بەشی مردووەكەی سێیەم دەدرێ: كە لە مەسەلەكانی تر گرتبووی، یان لە (وِفْق)ی بەشی

مردووەکەی سێیەم دەدرێ ئەگەر (تَوافُـق) هـەبێ، جـا ئەگـەر مردوویێکـی چوارەمیش بمرێ: چوارەمەکە بە دووەم دادەندرێ...ئیتر هەر بەو جۆرە ڕەفتار بکە، هـەروەك لـە (الأنوار)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿پاشکۆ: لە بارەی چۆنیەتی بەش کردنی میرات بە گوێرەی بەشە میراتەکان﴾

ئەم باسە زۆر گرنگەو بەرهەمی زانستی میراتە: جا ئەگەر میراتەکە: پارە بوو، یان ئـەو جۆرە شتانە بـوو: کـە ئـەندازەیان وەکـو یەکتری‌یـە، ئـەوە یەکسـەر بـە یـەکێك لـەو ڕێگایانەی داهاتوو بەش دەکـرێ، ئەگـەر نـا: ئـەوە میراتـەکـە دەقرسێندرێو بـە پـارە نرخی بۆ دیاری دەکرێ، ئینجا بە یەکێك لەو ڕێگایانـەی داهـاتووو چـەند ڕێگایـەکی تـر بەش دەکرێ، هەروەك لە (الأنوار)و (حاشیة البقری)دا ڕوون کراوەنەوە.

**ڕێگەی یەکەم:** بەشـە مـیراتی گشـت مـیراتگرێك –کـە لـە مەسـەلەکە گرتوویـەتی– لـە هەموو میراتەکە بدە، ئینجا کۆی لێدانەکـە گەیشـتە کـام ژمـارە، ئـەو ژمارەیـە بەسـەر مەسەلەکەدا بەش بکە، لەو بەشکردنە چەند دەرچوو، ئەوە بەشـی میراتگرەکەیـە، **بـۆ وێنە:** میراتگرەکان دایكو ژنێـكو مـامێك بـوونو، میراتەکـەش سـەد دینـار بـوو، ئـەوە مەسەلەکە لە دوانزەیە: سێ بۆ ژنەکەو، چوار بۆ دایکەکەیەو، پێنج بۆ مامەکەیە، ئینجا سێیەکەی ژنەکە لە سەد دینارەکە بدە دەگاتە سێ سـەد، بەسـەر دوانزەکـە دابەشـی بکە: بیستو پێنج دەردەچێ، کەواتە: بەشی ژنەکە لەو سەدە: بیستو پێنـج دینـارە. ئەمجارەش چوارەکەی دایکەکەش لە سەد دینارەکە بـدە دەگاتـە چوار سـەد، بەسـەر دوانزەکەدا بەشی بکە: سیو سێو سێیەکێك دەردەچێ، کەواتە: بەشی دایکەکە سـیو سێ دینارو سێیەکە دینارێکە. ئەمجارەش پێنجەکەی مامەکـە لـە سـەد دینارەکـە بـدە دەگاتە پێنج سەد، بەسەر دوانزەکەدا بەش بکـە: چلو یـەك دوو سـێیەك دەردەچـێ، کەواتە: بەشی مامەکە چلو یەك دینارو دوو سێیەکە دینارە.

**ڕێگەی دووەم:** بەشی هەر میراتگرێك –کە لە مەسەلەکە گرتوویەتی– نیسبەت بـدە لای مەسەلەکە، بە گوێرەی ئـەو نیسـبەتە لـە میراتەکـە وەربگـرەو بیـدە میراتگرەکـە، **بـۆ وێنە:** لە مەسەلەکەی ڕابردوودا: سـێیەکەی ژنەکـە چوارێکـی مەسـەلەکەیە، کـەوابوو: چوارێکی سەد دینارەکە: بیسـتو پێنـج دینـارە بیـدە ژنەکـە. چوارەکـەی دایکەکـەش سێیەکی مەسەلەکەیە، کەوابوو: سێیەکی سەد دینارەکـە: سـیو سـێ دینـارو سـێیەکە دینارێکە، بیدە دایکەکە. پێنجەکەی مامەکەش چوارەکێكو شەشێکێکی مەسـەلەکەیە،

وَأَحْمَـــدُ اللهَ عَلَـــى أَنْ كَمَّلَـــهْ ٤٢١ مُصَلِّيـــاً عَلَـــى نَبِـــيٍّ فَضَّلَـــهْ
وَلِجَمِيـــعِ العَـــالَمِينَ أَرْسَـــلَهْ ٤٢٢ وَالآلِ وَالصَّحْـبِ السُّـراةِ الْكَمَلَـــةْ

---

كەوابوو: چوارێکی سەد دینارەکە -کە بیستو پێنج دینـارە- لەگەڵ شەشێکی سەد دینارەکـە -کـە شـانزە دینـارو دوو سێیەکە دینـارە- دەکاتـە چلو یـەك دینـارو دوو سێیەکە دینار، بیدە مامەکە.

(وَأَحْمَدُ اللهَ عَلَى أَنْ كَمَّلَهُ) شوکرو سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە یارمـەتی دام ئـەم هۆنراوەیە تەواو بکەمو، هەم (مُصَلِّياً عَلَى نَبِـيٍّ فَضَّلَـهُ) سـەلاواتو سـەلام لەسـەر ئـەو پێغەمبەرە ﷺ لێ دەدەم: کە خوای گەورە لە گشت دروستکراوێکی گـەورەتری کـردوەو ناوی (محمد)ە ﷺ (وَلِجَمِيعِ العَالَمِينَ أَرْسَلَهُ) خوای گـەورە ئـەوی بـە پێغەمبەرایـەتی بـۆ هەموو فریشـتـەو ئـادەمیزادو جنۆکـە نـاردوە (وَالآلِ وَالصَّحْبِ) هـەم سـەلاواتو سـەلام لەسەر خزمە موسوڵمانەکانی پێغەمبەرو ﷺ صەحابەکانی بێ (السُّراةِ) کە گەورەی ئـەم ئوممەتەنو، هەم (الْكَمَلَةْ) لە زانستدا تەواون... کۆتایی.

منیش بەندەی بەند کراو بە داوی تاوانو، پێویست بەرەحمو لێبوردنـی خـوای گـەورە، خزمەتکاری زانستو زانایانی ئیسلام (**عبدالله عبدالعزیز هەرتـەلی**) شـوکری خـوای گەورە دەکەمو سەلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێ دەدەم، کە خوای گەورە یارمـەتی دام: هۆنراوەی (قَطْرُ العَارِض فِي عِلْمِ الْفَرَائِض) دانراوی (الشـيخ معـروف النودەهـي) ڕوون بکەمەوە بە زمانی شیرینی کوردی: لە ڕۆژی چوار شەممە (٢)ی مانگی (رجب)ی سـاڵی (١٤٢٢)ی کۆچی، بەرامبەر (٢٨)ی (گەلاوێژ)ی ساڵی (٢٧٠١)ی کـوردی، خـوای گـەورە لە خۆمو دایکمو باوکمو خۆشەویستانم خۆش ببێ، آمین.

وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّم عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين وَالْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَـالَمِين، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ العَلِيِّ العَظِيمِ.

**هەولێر ـ کوردستان**

٢ی ڕجب ١٤٢٢ی کۆچی

٢٨ی گەلاوێژ ٢٧٠١ی کوردی

١٩ی ئەیلول ٢٠٠١ی زایینی

# ناوەڕۆکی ڕوونکردنەوەی ( قَطْرُ العارِض فِی عِلْمِ الفَرَائِض )




پیتچنین و کۆمپیوتەر تەصمیم
صادق وسو خۆشناو